حکومەتی هەرێمی کوردستان - عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی

حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

بۆ پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی

دانانی
لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە

بژارکردن و داڕشتنەوەی هەردوو بەشی ڕێزمان و ئەدەب

شێرکۆ ئەحمەد حەوێز
محەمەد ئەحمەد محەمەد
ئەلمان ئەحمەد سەلیم
فەیصەل مصطفی حاجی
وارتکیس موسیس سەرکیسیان
سگڤان جەمیل محەمەد

چاپی سێیەم
٢٧٠٩ کوردی
٢٠٠٩زایینی

چاپخانەی ئەکاسیا - هەولێر

## پێشدەستی:

هەر بە مەبەستی بژارکردنو پێداچوونەوەی پەرتووکەکانی زمانو ئەدەبی کوردی قۆناغی ناوەندی، وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان لیژنەیەکی پێکهێنا، تایبەت بە پەرتووکی پۆلی سێیەمی ناوەندی، بۆ ئەوەی چاوێك بە پەرتووکی پێشوودا بخشێنێتو ئەو شوێنەی کە پێویستی بە دەست کاری کردنو گۆڕین هەبێ. کاری تیادا بکاتو پوختو ڕێکی بخات، لیژنەکەمان قورسایی کارەکەی خۆی خستە سەر هەردوو بەشی ڕێزمانو ئەدەب، ئەوەی بە پەسەند زانرا بۆ ڕێکخستنەوەی پەرتووکەکە، کرا، بەتایبەتی ئەو ڕێبازەی گرتە بەر کە لە هەردوو پەرتووکی پۆلی یەکەمو دووەمی ناوەندی گرتبوویە بەر، ئەویش هێنانەوەی چەند نموونەیەك لەهەردوو زاری سەرەکی زمانی کوردی (کرمانجی ژووریو ژێری)، هەروەها گۆڕینی بەشی هەرە زۆری ڕاهێنانەکانو هێنانەوەی ڕاهێنانی تازە.

لەبەشی ئەدەبیشدا، تاکرا، هەندێ دەستکاری پێویست لەناوەڕۆکی بابەتەکاندا کرا، بەجۆرێکی وا کە بابەتەکان ڕوونترو ڕێك تر خرانە بەردەم قوتابیان وخوێندکاران، لەزۆر شوێنیشدا، نموونەی تازەمان هێناوەو نموونە کۆنەکان وەلانران، ئەوەی شایانی باسیشە، بۆ هەر شاعیرو نووسەرێك (هۆنراوەو پەخشان) ئەو بڕەمان دەست نیشان

کردووە کە قوتابی پێویستە لەبەری بکات، بۆیە مامۆستایانی بەڕێز بەر پرسن لەم کارە.

بەشی خوێندنەوەی پەرتووکەکە دەستکارییەکی وای تێدا نەکراوە، تەنیا هەندێ بابەتمان وەلاناو هەندێکی تر هاتنە شوێنیان.

دوا جاریش، داوا لە مامۆستایانی بەڕێزی زمانو ئەدەبیاتی کوردی دەکەین کە بەهۆی بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی پارێزگەکانیان ئاگادارمان بکەنەوە لە هەر کەمو کورتیو ناتەواوییەك کە لەکاتی وانە گوتنەوەدا هەستی پێدەکەن، بۆ ئەوەی بتوانین لە چاپەکانی داهاتوودا چاکیان بکەینەوە.

خوا پشت پەنای هەمووان بێ...

لیژنەی بژارکردنو
پێداچوونەوە

## ڕوونكردنەوە

وەزارەتی پەروەدەی حکومەتی یەکگرتووی هەرێمی کوردستان بە فەرمانی وەزاری ژمارە ١٤٥٧ لە ٢٠٠٧/٢/٨ لیژنەی پێکهێنا بۆ یەکخستنەوەی پەرتووکەکانی زمانو ئەدەبی کوردی هەردوو قۆناغی ناوەندیو ئامادەیی لەسەرتاسەری قوتابخانەو خوێندنگەکانی هەرێمی کوردستاندا. لیژنەکە دەست بەکاربوو، هەردوو پەرتووکی زمانو ئەدەبیو کوردی (ئیدارەی جارانی هەولیرو سلیمانی) کردە بنەمای ئەم یەکخستنەوەیە، بە لەبەر چاوگرتنی بەپیزییو بەهیزیی بابەتەکانی ناو ئەم دوو پەرتووکەو لەئەنجامدا ئەم پەرتووکەی لیٚ کەوتەوە، کە بەشی هەرە زۆری هەردوو بەشی ڕیزمانو ئەدەبەکەی لەلایەن لیژنەیەکی پیشووتری دارشتنەوەو بژارکردنی ئەم دوو بەشە ئامادەکرابوو، لەبەر ئەوە وا بە پەسند زانرا کە مافی ئەوانیشی بەسەرەوەبیت، هەروەها ئاماژە بە سەرچاوەی ئەو بابەتە گۆڕاوانەش کراوە کە هاتوونەتە ناو پەرتووکەکەوە، بۆیە داوا لە مامۆستایانی خۆشەویستی بابەتی زمانو ئەدەبی کوردی دەکەین کە دڵسۆزانە پا بەندی ناوەرۆکی ئەم پەرتووکە بنو هەر کەمو کوڕییەکی هەبیت بەهۆی پەروەردەکانی خۆیانەوە ئاگاداری بەڕیوەبەرایەتی گشتی پرۆگرامەکان بکەن لە وەزارەتی پەروەردە.

﴿ هیوادارین خوای گەورە هەموو لایەك سەر بخات ﴾

**لیژنە**

٢٠٠٧/٤/١٥

## بەشی ڕێزمان

# ناو
## له رووی دارشتنه‌وه

١-:

١- كه‌وێك له‌سه‌ر به‌رده‌كه هه‌ڵنیشت بوو.

٢- پاڵه‌ی كار ده‌كرد.

٣- ئه‌ڤینیا مه‌م و زینیٚ ناڤداره.

٤- ئازادی ده‌ستیٚ خۆ هاڤیته ده‌ستیٚ كامه‌رانی .

٥- پیاوه‌كه په‌زی له مێرگه‌كه دا ده‌له‌وه‌ڕاند .

٦- له هه‌موو هه‌ورێك باران نابارێت .

٧- ئاڤا چه‌می كێمه.

٢-

١- با كوردستان به دارستان بڕازێنینه‌وه.

٢- ره‌زڤان دوو گوڵدانی هێنا.

٣- جووتیاره‌كه ده‌سته‌كی له دوو جێگه داناوه.

٤- به‌ختیار دناڤ گوڵزارو نێرگزه‌جاڕدا گه‌ڕیا.

٥- شه‌رمین هه‌ندێك سه‌رینی كڕییه.

٦- زاناو توانا پێكڤه دچنه هاڤینگه‌ها شه‌قلاویٚ.

٧- نڤیسه‌رو هۆزانڤان و تۆره‌ڤانان به‌رهه‌مێن خۆ بلاڤ دكه‌ن.

٨- كۆكه‌و ناڵه‌ی نه‌خۆشه‌كه كاری لیٚ كردین.

٩- نەرمین حەز لە چاکەو جوانی دەکات.

١٠- هاوکارو هاوڕێ دڵسۆزن.

٢-ب:

١- دۆتماماتە گولاڤێ ژگولە باخێ دروست دکەت.

٢- خویشکا نەوزادی زیرەکە.

٣- هەڤالێن مە ژگردە سۆری چوونە کێوە ڕەشێ.

٤-تەمۆ لەبن رەشماڵەکە رەشمارێکی کوشت.

٥- دڵخواز سەرپۆشی هەیە.

٦- چەتۆ کەڤنە جلکان دفرۆشیت.

٧-ژێر پیاڵەکە گەلێك جوان بوو.

## خستنە روو

پێشتر زانیومانە کە ناو وشەیەکە بۆ ناو لێنانی شتێك یان گیانلەبەرێك چ مرۆڤ بێت و چ هەر گیانلەبەرێکی نر بێت بەکار دێت. ئێمە لەم وانەیەدا تەماشای ناو دەکەین لە رووی دارشتنیەوە،واتە لەرووی دروست کردنییەوە، ئەمجا ئەگەر سەیری بەشی ژمارە (١) بکەین، دەبینین لە رستەکاندا ناو هەیە بۆ نموونە:

١- له رسته‌ی یه‌که‌مدا وشه‌ی(که‌و,به‌رد) ناوی ساده‌ن و واتاو مه‌به‌ستێك نیشان ده‌ده‌ن،هه‌ریکه‌یان له یه‌ك وشه‌ی واتادار پێك هاتووه.

٢- له ڕسته‌ی دووه‌مدا وشه‌ی(پاڵه,کار) هه‌ردووکیان ناوی ساده‌ن هه‌ر یه‌که‌یان واتا و مه‌به‌ستێك نیشان ده‌دات،هه‌روه‌ها هه‌ر یه‌که‌یان له یه‌ك وشه‌ی واتادار پێکهاتووه.

٣-له ڕسته‌ی سێیه‌مدا وشه‌ی (ئه‌ڤین،مه‌م،زین) ناوی ساده‌ن واتاو مه‌به‌ستێك نیشان ده‌ده‌ن،هه‌ریه‌که‌یان له یه‌ك وشه‌ی واتادار پێکهاتووه.

٤-له ڕسته‌ی چواره‌مدا وشه‌ی(ئازاد،ده‌ست،کامه‌ران)ناوی ساده‌ن ماناو مه‌به‌ستێك نیشان ده‌ده‌ن،هه‌ریه‌که‌یان له یه‌ك وشه‌ی واتادار پێکهاتووه.

٥-له رسته‌ی پێنجه‌مدا وشه‌ی (پیاو،په‌ز،مێرگ)ناوی ساده‌ن ماناو مه‌به‌ستێك نیشان ده‌ده‌ن، هه‌ریه‌که‌یان له یه‌ك وشه‌ی واتادار پێکهاتووه.

٦- له رسته‌ی شه‌شه‌مدا وشه‌ی(هه‌ور، باران) ناوی ساده‌ن ماناو مه‌به‌ستێك نیشان ده‌ده‌ن،هه‌ریه‌که‌یان له یه‌ك وشه‌ی واتادار پێکهاتووه.

٧- له رسته‌ی حه‌وته‌مدا وشه‌ی(ئاڤ ، چه‌م) هه‌ردووکیان ناوی ساده‌ن و ماناو مه‌به‌ستێك نیشان ده‌ده‌ن، هه‌ریه‌که‌یان له یه‌ك وشه‌ی واتادار پێکهاتووه.

هەروەها لە رستەكانی ژمارە(٢) دەبینین:

١- لە رستەی یەكەمدا وشەی (كوردستان،دارستان) هەردووكیان ناوی داڕژاون ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن، هەریەكەیان لە وشەیەكی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێكهاتووە، ناوی (كوردستان) لە ناوی (كورد) لەگەڵ پاشگری (ستان) پێكهاتووە،ناوی (دارستان) لە ناوی (دار) لەگەڵ پاشگری (ستان) پێكهاتووە ,واتە ( ناو + پاشگری ستان ).

٢- لە رستەی دووەمدا وشەی (رەزڤان، گوڵدان ) هەردووكیان ناوی داڕژاون ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن، لە ڕووی دروست كردنەوە ، لە وشەیەكی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێكهاتوون، ناوی ( رەزڤان ) لە ناوی (رەز) لەگەڵ پاشگری (ڤان) پێكهاتووە،ناوی (گوڵدان) لە ناوی(گوڵ) لەگەڵ پاشگری (دان) پێكهاتووە، واتە (ناو+ ڤان)، (ناو+دان).

٣- لە رستەی سێیەمدا وشەی(جووتیار،دەستەك،جێگە) هەرسێكیان ناوی داڕژاون و مانا و مەبەستێك نیشاندەدەن،لە ڕووی دروستكردنەوە هەریەكەیان لە وشەیەكی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێكهاتووە،ناوی (جووتیار) لە ناوی (جووت) لەگەڵ پاشگری (یار) پێكهاتووە، ناوی (دەستەك) لە ناوی (دەست) لەگەڵ پاشگری (ەك) پێكهاتووە، ناوی (جێگە) لە ناوی (جێ) لەگەڵ پاشگری (گە) پێكهاتووە، واتە ( ناو+یار)، (ناو+ەك) ، (ناو+ گە).

٤- له ڕستەی چوارەمدا وشەی (بەختیار، گوڵزار،نێرگزەجاڕ) هەرسێکیان ناوی داڕژاون و  ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن، هەریەکەیان له وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە، ناوی (بەختیار) له ناوی (بەخت) لەگەڵ پاشگری (یار) پێکهاتووەوناوی (گوڵزار) له ناوی (گوڵ) لەگەڵ پاشگری (زار) پێکهاتووە، ناوی (نێرگزەجاڕ) له ناوی (نێرگز) و ئامرازی(ە)و پاشگری (جاڕ) پێکهاتووە، واتا  (ناو+یار),(ناو+زار),(ناو +ە+جاڕ).

٥- له ڕستەی پێنجەمدا وشەی (شەرمین,سەرین) ناوی داڕژاون و ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن، هەریەکەیان له وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە، ناوی (شەرمین) له ناوی (شەرم) لەگەڵ پاشگری (ین) پێکهاتووە،ناوی (سەرین) له ناوی (سەر) لەگەڵ پاشگری(ین) پێکهاتووە،واتە (ناو+ین).

٦- لەڕستەی شەشەمدا وشەی (زانا,توانا،هاڤینگە) ناوی داڕژاون و ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن, هەریەکەیان  له وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە، ناوی (زانا) له ڕەگی کار (زان) لەگەڵ پاشگری (ا) پیچکهاتووە,ناوی (توانا) له ڕەگی کار (توان) لەگەڵ پاشگری (ا) پێکهاتووە،ناوی (هاڤیینگە) له ناوی (هاڤین) لەگەڵ  پاشگری (گە) پێکهاتووە، واتە (رەگی کار+ا)(ناو + گە).

٧–له ڕستەی حەوتەمدا وشەی (نڤیسەر,هۆزانڤان،تۆرەڤان) ناوی داڕژاون، هەریەکەیان واتاو مەبەستێك نیشان دەدەن،له ڕوی دروست کردنەوە هەریەکەیان له وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە،ناوی (نڤیسەر) له رەگی کار (نڤیس) لەگەڵ پاشگری (ەر) پێکهاتووە، ناوی (هۆزانڤان) له ناوی (هۆزان) لەگەڵ پاشگری (ڤان) پێکهاتووە، ناوی (تۆرەڤان) له ناوی (تۆرە)(تۆر) لەگەڵ پاشگری (ڤان) پێکهاتووە،واتە(رەگی کار+ەر)(ناو+ڤان)

٨–له رستەی هەشتەمدا وشەی (کۆکە،ناڵە) ناوی داڕژاون و ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن، له ڕوی پێکهاتنەوە هەریەکەیان له وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە،ناوی (کۆکە) له رەگی کار (کۆك) لەگەڵ پاشگری(ە) پێکهاتووە، ناوی )(ناڵە) له ڕەگی کار (ناڵ ) لەگەڵ پاشگری (ە) پێکهاتووە واتە(ڕەگی کار+ە)

٩– له رستەی نۆیەمدا وشەی (نەرمین,چاکە ,جوانی) ناوی داڕژاون و ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن, هەریەکەیان له وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە ,ناوی (نەرمین) له هاوەڵناوی چۆنی (نەرم) لەگەڵ پاشگری (ین) پێکهاتووە, ناوی (چاکە) له هاوەڵناوی چۆنی (چاك) لەگەڵ پاشگری (ە) پێکهاتووە, ناوی (جوانی) له هاوەڵناوی چۆنی(جوان) لەگەڵ پاشگری (ی) پێکهاتووە, واتە (هاوەڵناو+پاشگر).

١٠-لە ڕستەی دەیەمدا وشەی (هاوکار،هاوڕێ) ناوی داڕژاون و ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن، لە ڕوی دروست کردنیەوە هەریەکەیان لە پێشگری (هاو) لەگەڵ ناوی (کار) پێکاتووە، ناوی هاورێ لە پێشگری (هاو) لەگەڵ ناوی (رێ) پێکهاتووە لە پێشگر + ناو.

هەروەها لە رستەکانی ژمارە (٢) بەشی(ب) دەبینین:

١- لە رستەی یەکەمدا وشەی(دۆتمام،گولاۋ ،گوڵەباخ) ناوی لێکدراون و ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن، لە رووی دروست کردنەوە هەریەکەیان بەم شێوەیە پێکهاتووە، ناوی (دۆتمام) لە دوو ناو پێکهاتووە،(ناو+ناو)،(دۆت+مام) ناوی گولاۋ لە دوو ناو پێکهاتووە(گوڵ+ئاۋ) واتە(ناو+ناو)، ناوی گوڵە باخ لە دوو ناو لەگەڵ ئامرازی (ە) کە کەوتۆتە نێوانیان پێکهاتووە،(گوڵ،ە,باخ)،(ناو+ە+ناو).

٢- لە رستەی دووەمدا وشەی(نەوزاد) ناوێکی لێکدراوە و ماناو مەیەستێك نیشان دەدات،ە هاوەڵناوی (نەو) لەگەڵ ناوی (زاد) پێکهاتووە، واتە (هاوەڵناو+ناو).

٣-لە رستەی سێیەمدا وشەی (گردە سۆر،کێوەڕەش ) ناوی لێکدراون و ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن، ناوی (گردەسۆر) لە ناوی (گرد) لەگەڵ ئامرازی (ە) و هاوەڵناوی (سۆر) پێکهاتووە،(ناو+ە+هاوەڵناو) ناوی (کێوەڕەش) لە ناوی (کێو) و ئامرازی (ە) و هاوەڵناوی(ڕەش) پێکهاتووە،(ناو+ە+هاوەڵناو).

٤- له ڕستەی چوارەمدا وشەی ( ڕەشماڵ،ڕەشمار) ناوی لێکدراون ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن ،ناوی (ڕەشماڵ) له هاوەڵناوی چۆنی (ڕەش) لەگەڵ ناوی (ماڵ) پێکهاتووە، ناوی (ڕەشمار) له هاوەڵناوی چۆنی (ڕەش) لەگەڵ ناوی(مار) پێکهاتووە، واته(هاوەڵناوی چۆنی+ناو).

٥- له رستەی پێنجەمدا وشەی (دڵخواز، سەرپۆش) ناوی لێکدراون و ماناو مەبەستێك نیشان دەدەن،ناوی (دڵخواز ) له ناوی (دڵ) لەگەڵ ڕەگی کار (خواز) پێکهاتووە،ناوی( سەرپۆش) له ناوی (سەر) لەگەڵ ڕەگی کار (پۆش) پێکهاتووە، واته(ناو+ڕەگی کار).

٦-له رستەی شەشەمدا وشەی (کەڤنەجلك) ناوێکی لێکدراوە و ماناو مەبەستێك نیشان دەدات، له هاوەڵناوی (کەڤن) و ئامرازی (ە) و ناوی (جلك) پێکهاتووە،(هاوەڵناو +ە+ناو).

٧-له رستەی حەوتەمدا وشەی (ژێرپیاڵە ) ناوێکی لێکدراوەو ماناو مه بەستێك نیشان دەدات ، له هەاوەڵکاری (ژێر ) له گەڵ ناوی (پیاڵە ) پێکهاتووە واته ( هاوەڵکار + ناو )

## دەستوور

:ناو لەڕووی دارشتنیەوە ( دروست کردنیەوە ) دەکرێت بە دووجۆر

١- ناوی سادە : ئەو ناوەیە کە لە یەك وشەی واتادار پێکهاتووە
ماناو مە بەستێکی داوە بە دەستەوە وەکو ( کەو ، بەرد ، هەور، دەست )

٢- ناوی ناسادە ئەمیش دەکرێت بە دووجۆر :

١- ناوی دارڕژاو: ئەو ناوەیە لە وەشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك یا لەگەڵ پیشگرێك
پێك هاتووە بەم شێوەیە :

١- ( ناو + پاشگر ) وەکو ( کوردستان ، گوڵدان ، شەرمین ،جێگا )

٢- ( ناو + ە +پاشگر ) وەکو ( نێرگزە جار )

٣- ( ڕەگی کار + پاشگر ) وەکو ( زانا ، نالە ، نڤیسەر )

٤- ( ئاولناو + پاشگر ) وەکو ( نەرمین ، چاکە ، جوانی )

٥- ( پێشگر + ناو ) وەکو ( هاوکار ، هەڤال ، هەمسەر ، هامراز )

ب- ناوی لێکدراو : ئەو ناوەیە کە لە دوو وشەی واتادار یا پتر پێکهاتووە ،بەم شێوەی خوارەوە:

١- ( ناو + ناو ) وەکو ( دۆتمام ، سۆلاڤ ، ماستاو )

٢- ( ناو + ە + ناو ) وەکو ( گوڵە باغ ، گوڵە گەنم )

٣- ( ناو + ە + هاوڵناو ) وەکو ( گردە سۆر ، کێوە رەش ، کێلە شین )

٤- ( هاوڵناو + ناو ) وەکو ( ڕەشماڵ ، رشمار ، سۆرگوڵ ، نەوزاد )

٥- ( ناو + ڕەگی کار ) وەکو ( داخۆش ، سەرپۆش )

٦- ( هاوەڵکار + ناو ) وەکو ( ژێرپیاڵە ، ژێرزەمەنین )

## ڕاهێنانی ( ١ )

بۆ هەریەکێك لەم پاشگرانەی خوارەوە دوو ناوی داڕژاو بهێنە و لە ڕستەدا بە کاریان بهێنە : ( ایی ، ین ، ەڵان ، گار ، ێن )

## ڕاهێنان ( ٢ )

پێنج ناوی لێکدراو بهێنەوە بە مەرجێك سێیان لە هاوەڵکارو ، ناوێك پێکهاتبێت و یەکێك لە دوو ناو پێکهاتبێت و ئەوی تر لە ناوێك و ڕەگی کار پێکهاتبێت .

## راهێنانی (٣)

لەم دێرە هۆنراوەی خوارەوە هەرچ ناوێك هەیە دەری بهێنەو جۆرەکەی دیار بخە :

١- گەرمی و تەڕی ی بەهارە کە پشکۆ کوژایەوە
پشکۆی گولا تەشین بە نەسیم بوو گەشایەوە - نالی -

٢- دەستم کە بەسەت وەعدە لەسەد جێگە شکاوە
جەبری نییە ئەم کەسرە هەتا نەیخەمە ئە ستۆ - نالی -

٣- سۆرگوڵی تەڕ ژ خوناڤێ
لێڤ کولیلکا بێن گولاڤێ
رووی چۆ هەیڤا پرسیتاڤێ
کوشتم تە ب داخا دووچاڤا
تیر کو بەردا بوو هناڤا
نەشیام ئەز پاڤێم دووگاڤا
ژ کویری و ساریا برینێ

- تاهیر رۆشدی -

## راهێنان (٤)

لەم پارچە نووسینەدا هەرچ ناوێك هەیە دەری بهێنە، چۆن دروست کراوە ؟

( دەگێڕنەوە جوامێر پیاوەکی بە تەمەن و دونیا دیتە بوو، ڕۆژەکی بەهارێ دگەڵ چەند هەڤالێن خۆ چوونە ئاقاری ، ل بن دار هەنارێك روونیشتن ، ناوچەکە بە گوڵ و نێرگزو شەوبۆ

داپۆشرابوون قاسپەی کەو ، دەنگێ سویسکەو باڵندەکانی تر لەگەڵ خورەی ئاوی قەد پاڵی چیا تێکەڵ بەیەکتر دەبوون ،دڵێ وان ب ڤی دیمەنی گەلەك خۆش بوو، پاشی کە نانیان خوارد ، جوامێر دەستێ خۆ هاڤێتە پاخەلا خۆو چە قووەك دەرهێنا ، سێوەکانی پێ کردە دوو کەرت و دابەشی کردن ، ئەڤجا دنکە سێوەکانی کۆکردەوە رابوو چوو وێڤەتر جهەك خۆش کردو بە چەقووا خۆ زەڤی کۆلا و هندەك دندك چاندن ، گۆت : رۆژك دێ هێت ئەڤان دندکان دبنە دارسێڤ ، دێ سێڤێن سۆرگرن ، لە مێژە گوتراوە ، ( چاندیان، خواردمان ، دە چێنین ، دەخۆن ) .

## راڤە کردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| هەڵنیشت | : | دادا |
| پاڵە | : | کرێکار |
| هاڤێتە | : | خستیە : دایە |
| دەلەوەڕاند | : | دچەراند |
| بڕازێنەوە | : | بخەملینین |
| سەرین | : | بالیف |
| کۆکە | : | کۆخك |
| دۆتمام | : | کچە مام |
| سەرپۆش | : | دەرسۆك |

بێن : بۆن

نەشیام : نەمتوانی

گاڤ : هەنگاو

رابوو : هەڵسا

پشکۆ : پەنگر

گولا تەشێن : گوڵ ئاگرین

لێڤ کولیکا : لێو کوڵوکە, لێو گوڵ

ژکویری و ساریا برینێ : لەبەر قوڵی و ساردی برینم

ئاقاری : دەڤەری گوندی

دەستێ خۆ هاڤیتە پاخەلاخۆ : دەستی برد بۆ ناو گیرفانی

دندك : دەنك، دنـــك

## چـــــــــاوگ

(ئاشكرايه كه نەتەوەی كورد زۆر لەمێژە لە تێكۆشانێكی سەختی بەردەوام بووە، بۆ ڕزگاركردنی نیشتمانەكەی لەژێر چەپۆكی داگیركەراندا، ڕابوون و ڕاپەڕین و شۆڕشی بەرپاكردووە، قوربانی دان لە پێناوی ئەم مەبەستە پیرۆزەیدا، بە ئەركێكی ڕەوا زانیوە، هەڵستانەوەی دوای كەوتنی، نیشانەی نەبەردی و زیندوویی بووە، پتەوكردنی ریزەكانی گەل و یەكگرتنی هەموو لایەكان و هەڵمەت بردن بۆ سەر دام و دەزگای ڕژێم لە ڕاپەڕینە مەزنەكەی بەهاری (١٩٩١)ز سەركەوتنی بەدەست هێنا، دامەزراندنی پەرلەمان و حوكومەتی كوردستان بەرهەمی خوێنی شەهیدانی گەلی كوردستانە.

پاراستنی ئەم دەستكەوتە مەزنانە ئەركێكی نیشتمانییە لەسەر شانی هەموو مرۆڤێكی دڵسۆز، چوون بەرەو بەدەست هێنانی ئامانجی پیرۆزتر، هەر بە ڕێكخستنی ریزەكانی گەل و چەسپاندنی یاساو چارەسەركردنی كێشەكان لە ڕێگای گفتوگۆو دانیشتن لەسەر مێزی ئاشتی و گرنگی دان بە خوێندن و فراوان كردنی پرۆسەی دیموكراسی دەبێت).

### خستنە ڕوو:

لەم پارچە نووسینەی سەرەوە ئەگەر سەیری پەیڤەكانی (تێكۆشان، ڕزگاركردن، ڕابوون، ڕاپەڕین، قوربانی دان، هەڵستانەوە، كەوتن، پتەوكردن، یەكگرتن، هەڵمەت بردن، ڕاپەڕین، سەركەوتن، دامەزراندن،

پاراستن، چوون، بەدەست هێنـان، ڕێکخستن، چەسپاندن، چـارەکردن، دانیـشتن، گرنگـی دان، خوێنـدن، فـراوان کـردن) بکـەین، دەبیـنین هـەر یەکەیان مانایەکی سـەربەخۆی هەیـە. هـەروەها هـەر یەکـەیان لەشـوێنی خۆیدا ڕوودانێك یا کردەوەیەك دەردەخات بەڵام نەدراوەتـە پـاڵ کەسـێك یا شتێكو کاتی تێدا دیار نییـە، گـەردانیش ناکرێـت، بـەو جـۆرە وشـانە دەگوترێـت چـاوگ (ژێـدەر). ئەگـەر جـارێکی تـر سـەیری ئـەو چـاوگانە بکەین، دەبینین.

١. هەر یەکێك لەو چاوگانە کۆتاییان بە (ان، ین، دن، تن، وون) هاتووە کە پێی دەگوترێت نیـشانەی چـاوگ بـەم پێیـە چـاوگ دەکرێـت بـە پێنج بەشەوە.

١. **چاوگی ئەلفی** : ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (ا)یە.
٢. **چاوگی یائی** : ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (یـ)یە.
٣. **چاوگی دالی** : ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (د)یە.
٤. **چاوگی تائی** : ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (تـ)یە.
٥. **چاوگی واوی** : ئەو چاوگەیە کە پیتی پێش (ن) (وو)ە.

هـەروەها بـە پیتـی (ن)ی کۆتـایی چـاوگ دەگوترێـت نـوونی چـاوگ، ئـەمجا هـەر چ چـاوگێك لەزمانەکەمانـدا هەیـە کۆتـایی بـە یـەکێك لـەو نیشانانەی سەرەوە دێت.

٢. هەر یەکێك لەم چاوگانە لە ڕستەدا وەکو ناوێك بەکاردێت.

٣. چـاوگ سەرچـاوەی دارشـتنی کـارە لەکاتـە جیاوازەکانـدا دەبێتـە سەرچاوەی دروست کردنی گەلێك وشەی تر.

هەندێك چاوگ هەن بێ پاشگری (ەوە) مانایان تـەواو نابێـت، وەكـو (خـولان- حەسـان- پـاڕان- كـولان- ڕشـان). لەگـەڵ پاشـگری (ەوە) دەبنــە (خولانــەوە- حەسـانەوە- پاڕانــەوە- كولانــەوە- ڕشـانەوە). چـاوگی دالی لــە هەنــدێك شــوێنی كرمــانجی ژووروو پیتــی (د)ی تێـدا دەرناكەوێت وەكو (مردن، مرن- خواردن، خوارن- بردن، برن).

**دەستوور:**

**چاوگ وشەیەكە ڕووداندێك یا كردەوەیەك نیشان دەدات، بەڵام ئـەم كردەوەیـە نەخراوەتە پاڵ كەسێك یا شتێك، كاتیشی تێدا دیار نییە.**
**لەڕستـەدا وەكـو نـاو بـەكاردێتو هـەموو تایبەتییـەكانی نـاو وەدەگرێـتو ئەركەكانی ناویش دەبینێت. دەبێتە سەرچاوەی دروست كردنی كارو گەلێك وشـەی تریش. نیشانەكانی چاوگ ئەمانەن: (ان- ین- دن- تن- وون).**
**بە پیتی (ن)ی كۆتایی چاوگ دەگوترێت (نوونی چاوگ).**

## ڕاهێنان (١)

ئەم چاوگانە لەڕستەدا بەكاربهێنە:

دروون، لڤین، كەوتن، هەڵبژاردن، سەركەوتن، چوون، یەككگرتن.

## ڕاهێنان (٢)

نموونە بە ڕستە بۆ ئەمانە بهێنەوە:

ئـ – دوو چاوگی ئەلفی.
ب– دوو چاوگی یائی.
پ – دوو چاوگی تائی.
ت – دوو چاوگی واوی.
ج – دوو چاوگی دالی.

## ڕاهێنان (٣)

لەم دێرە هۆنراوانەی خوارەوەدا هەر چ چاوگێك هەیە دەری بهێنە:

١. **ژیانی من بەبێ تۆ چاوەکەم قوربانی مردن بێ**

**پیاڵەی عەیشەکەی من دوور لە باڵاکەت سەرەو بن بێ** (فکری)

٢. **ڕۆژگار هەمووی هەر کار بێ‌و فرمان**

**هەر چەوسانەوە، زیان ئازار دان** (کامل ژیر)

٣. **من ئومێدە بچمە واری لیسەکی ئاڤا بکەم**

**هەر ژ زانین پێشڤەدا بچن بۆ بهار خەملانە دل** (کەتانی)

٤. **دابهێت ڕۆژا کەنینێ‌و گەشتنا چەندی دلا**

**ڕێك دبن گوڵ چەند ڕەنگی دا بگەڕیت ئەزمانە دل** (کەتانی)

## ڕاهێنان (٤)

جیاوازی لەنێوان وشەی (ڕۆیشتن) لەم دوو ڕستەیەدا چییە، ڕوونی بکەرەوە:

١. ڕۆیشتن جۆرێکە لە وەرزش.

٢. ئەوان ڕۆیشتن بۆ کتێبخانە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| تێکۆشانێکی سەخت | : | خەباتەکا گران |
| چەپۆك | : | تەپ |
| پتەوکردن | : | موکمکردن |
| درووَن | : | دروین |
| لڤین | : | جولانەوە |
| بالآ | : | بەژن |
| لیس | : | کۆلێت، زنج، کووخ |
| فرمان | : | ئیش، شوول |
| بچمە واری | : | بچمە هەواری |
| ڕۆژا کەنینێ | : | ڕۆژی شادیو پێکەنین |

# چـــاوگ
# لەڕووی دارِشتنییەوە

١/

١. کوتانی منداڵان دژی نەخۆشییەکان پێویستە.

٢. ب هاتنا وە ئەم دڵشاد بووین.

٣. وڵاتەکەمان بە چاندنی درەخت دەڕازێتەوە.

٤. نرخی دروونی کراسەکە گران بوو.

٥. پشکڤتنا بشکۆژێن گوڵان ل بهاران دبیت.

٦. خوێندنم تەواو کردووە.

٢/ ئـ-

١. پ ڤەکرنا خوێندنگەهان وەلات پێش دکەڤیت.

٢. هەڵبژاردنەکەیان ئەنجامدا.

٣. ڕاسپاردنەکەم پێ گەیشت.

٤. تێگهێشتن بناغەی زانستێیە.

٥. هەر بە خوێندنەوە زانیاریی نوێ فێردەبین.

٦. وەراندنی گوڵی باخان قەدەغەیە.

٧. هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ بۆ ئێمە پێویستە.

ب-

١. ئاڤدانا باغچان گەلەك پێدڤییە.

٢. ئێمە بۆ یارمەتی دانی ئێوە هاتووین.

٣. جوان کردنی شار ئەرکێکی نیشتمان پەروەرییە.

٤. بە گەرم بوون تەنە ڕەقەکان لێك دەکشێن.

**٥. دەست پیٚ کرنا هەر کارەکی پێویستی ب نەخشە دانانیٚ هەیە.**

**٦. ڕاستکردنەوەی هەڵەکانم خوێندەوە.**

**٧. ل ناڤ برنا زۆر داریێ ئارمانجامەیە.**

**٨. لە خۆ چوون دیاردەی نەخۆشییە.**

**٩. بە بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان لایەنەکان کۆمەلٚ بەرەو خۆشی دەچێت.**

## خستنە ڕوو:

لەبابەتی پێشوودا ئەوەمان زانی کە چاوگ ڕوودانێك نیشان دەداتو بەکات نەبەستراوەتەوەو نەخراوەتە پالٚ کەسێك یا شتێك بەلاّم لێرەدا مە دڤێت بزانین کە چاوگ لەڕووی دروست کردنییەوە چەوا پێك دێت؟ کاتێك سەیری ڕستەکان دەکەین، دەبینین چاوگ لەڕووی دروست کردنییەوە بەم شێوەی خوارەوە دەبێت:

١- لەڕستەکانی ژمارەیەکدا (١) پەیڤەکانی (کوتان، هاتن، چاندن، دروون، بشکڤتن، خوێندن) هەموویان چاوگی سادەن، هەر یەکێك لەم چاوگانە ڕووداێکی نیشان داوەو مانایەکی سەربەخۆی هەیە، بەلاّم ئەگەر لەڕووی دروست کردنییەوە تەماشای بکەین، دەبینین هەر یەکێکیان لە یەك وشەی واتادار پێکهاتووە.

١. ئـ: لەڕستەکانی ژمارە (٢)ی بەشی (ئـ)دا وشەکانی (ڤەکرن، هەلٚبژاردن، دەرکەوتن، ڕاسپاردن، تێگەیشتن، سەرکەڤتن، خوێندنەوە، وەراندن، هەلٚدانەوە) هەموویان چاوگی داڕێژراون. لە

ڕووی دروست کردنیانەوە هەر یەکێك لەم چاوگانە لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ زیادەیەك پێکهاتووە، بەم شێوەی خوارەوە:

١. چاوگی (ڤەکرن) لە پێشگری (ڤە) لەگەڵ چاوگی سادە (کرن) پێکهاتووە.

٢. چاوگی (هەڵبژاردن) لە پێشگری (هەڵ) لەگەڵ چاوگی سادە (بژاردن) پێکهاتووە.

٣. چاوگی (ڕاسپاردن) لە پێشگری (ڕا) لەگەڵ چاوگی سادە (سپاردن) پێکهاتووە.

٤. چاوگی (تێگەیشتن) لە پێشگری (تێ) لەگەڵ چاوگی سادە (گەیشتن) پێکهاتووە.

٥. چاوگی (خوێندنەوە) لە چاوگی سادە (خوێندن) لەگەڵ پاشگری (ەوە) پێکهاتووە.

٦. چاوگی (وەراندن) لە چاوگی سادە (وەرین) لەگەڵ پاشگری (اندن) پێکهاتووە. لێرەدا ڕەگی کار وەردەگیرێت (وەر+ اندن).

٧. چاوگی (هەڵدانەوە) لە پێشگری (هەڵ)و چاوگی سادە (دان)و پاشگری (ەوە) پێکهاتووە.

٢- ب: لە ڕستەکانی ژمارە (٢)ی بەشی (ب)دا پەیڤەکانی (ئاڤدان، یارمەتیدان، جوان کردن، گەرم بوون، دەست پێ کردن، ڕاست کردنەوە، لە ناڤ بردن، لە خۆچوون، بەهێزکردن) هەموویان چاوگی

لێکدراون لە ڕووی دروست کردنیانەوە هەر یەکێکیان لە دوو وشەی واتادار یا پتر پێکهاتووە، بەم شێوەی خوارەوە:

١. چاوگی (ئاڤدان) لە ناوی (ئاڤ) لەگەڵ چاوگی سادە (دان) پێکهاتووە.
٢. چاوگی (یارمەتی دان) لەناوی (یارمەتی) لەگەڵ چاوگی سادە (دان) پێکهاتووە.
٣. چاوگی (جوان کردن) لە هاوەڵناوی (جوان) لەگەڵ چاوگی سادە (کردن) پێکهاتووە.
٤. چاوگی (گەرم بوون) لە هاوەڵناوی (گەرم) لەگەڵ چاوگی سادە (بوون) پێکهاتووە.
٥. چاوگی (دەست پێکرن) لە ناوی (دەست) لەگەڵ چاوگی داڕێژراوی (پێکرن) پێکهاتووە.
٦. چاوگی (ڕاست کردنەوە) لە هاوەڵناوی (ڕاست) لەگەڵ چاوگی داڕێژراوی (کردنەوە) پێکهاتووە.
٧. چاوگی (ل ناڤ برن) لە گرێی هاوەڵکاری (ل ناڤ) لەگەڵ چاوگی سادە (برن) پێکهاتووە.
٨. چاوگی (لە خۆچوون) لە گرێی ناویی (لە خۆ) لەگەڵ چاوگی سادە (چوون) پێکهاتووە.
٩. چاوگی (بەهێز کردن) لەگرێی هاوەڵناویی (بەهێز) لەگەڵ چاوگی سادە (کردن) پێکهاتووە.

## دەستوور:

چاوگ لەڕووی داڕشتنییەوە دەکرێت بە دوو جۆر:

١. چاوگی سادە: ئەو چاوگەیە کە تەنیا لەیەك وشەی واتاداری سەربەخۆ پێکهاتووە. وەك: نووسین، خوێندن، نووستن، کێڵان، بوون، کردن

٢. چاوگی ناسادە: ئەمیش دەکرێت بە دوو جۆر:

ئـ- چاوگی داڕێژراو: ئەو چاوگەیە کە لە چاوگێکی سادە لەگەڵ پێشگرێك یا لەگەڵ پاشگرێك یا لەگەڵ هەردووکیان پێکهاتووە:

١- (پێشگر+ چاوگی سادە) وەك: هەڵبوون، ڕاکردن، بەرکەوتن، لێدان.

٢- (چاوگی سادە+ پاشگر) وەك: خواردنەوە، خوێندنەوە.

٣- (پێشگر+ چاوگی سادە+ پاشگر) وەك: هەڵبوونەوە، ڕاکردنەوە، لێدانەوە.

پێشگرەکان: (هەڵ، دا، ڕا، پێ، تێ، دەر، بەر، ڤە، لێ).

پاشگرەکان: (ەوە، اندن)

ب- چاوگی لێکدراو: ئەو چاوگەیە لە چاوگێکی سادە یا داڕێژراو لەگەڵ وشەیەکی واتاداری تر یا پتر پێکهاتووە. بەم شێوەیە:

١- (ناو + چاوگی سادە) وەك: یارمەتیدان، دەستگرتن.

٢- (هاوەڵناوی چۆنی+ چاوگی سادە) وەك: گەورەکردن، گەرم بوون.

٣- (ناو+ چاوگی داڕێژراو) وەك: دەست هەڵگرتن، سەرهەڵبڕین.

٤- (هاوەڵناوی چۆنی+ چاوگی داڕێژراو) وەك: ڕاستکردنەوە، چاکبوونەوە.

٥- (گرێی ناوی+ چاوگی سادە) وەك: بەخێوکردن.

٦- (گرێی هاوەڵناوی+ چاوگی سادە) وەك: بەهێزکردن.

٧- (گرێی هاوەڵکاری+ چاوگی سادە) وەك: لە ناڤ چوون، لەناوبردن.

گرێی ناوی و هاوەڵناوی و هاوەڵکاری لەگەڵ چاوگی داڕێژراویش چاوگی لێکدراو پێك دەهێنن.

## ڕاهێنان (١)

لەم چاوگە سادانەی خوارەوە چاوگی داڕێژراوو لێکدراو دروست بکە:

(چوون، کێشان، گرتن، کەڤتن، بڕین، هێنان)

## ڕاهێنان (٢)

جیاوازی لەنێوان چاوگی داڕێژراو و لێکدراو چییە لە ڕووی دروست کردنییەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان (٣)

لەم دێرە هۆنراوانەی خوارەوەدا چاوگەکان دەربهێنەو جۆرو شێوەی دروست کردنیان دیار بخە:

١. **لاوی کورد مەردە لەمردن قەتعییەن باکی نییە**
**پەندی پێشینان ڕاستە بەرخی نێر بۆ سەربڕین** (بێکەس)

٢. **هەر چەندی بسۆهتنێ وەکی من**
**ئەمما نە بگۆهتنێ وەکی من** (خانی)

٣. **لەسەر خۆ چوونە، شەیدا بوونە، قوڕ پێوانە، سووتانە**
**هەتا مردن موحببەت ئیشی زۆرە ڕێزی لێ دەگرم** (مەحوی)

## ڕاهێنان (٤)

(خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە)

چەند دێڕێك لەسەر ئەم باسە بنووسە، ئەمجا هەر چاوگێك هەبێت دەری بهێنەو جۆرەکەی بنووسە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| ↑ | | ↓ |
|---|---|---|
| وە | : | ئێوە |
| بشکۆژ | : | خونچە |
| بناغە | : | بنیات |

# بەکارهێنانی چاوگ وەکو ناو

ئـ/

١. نووسینەکەم هێناوە.

٢. نووسینەکانم کۆکردەوە.

٣. ئاخافتنا باش دلێ مرۆڤی خۆش دکەت.

٤. نووسینی هێمنم خوێندۆتەوە.

٥. هاتنا وان بۆ کارگەهێ گەلەك باش بوو.

ب/

١. نقستن بۆ نەخۆشی دەرمانە.

٢. سووتانی لەش بە ئازارە.

٣. خوێندن کۆمەڵ پێش دەخات.

٤. خۆزی کوشتن ل وەلاتێ مە نەمابا.

٥. خوێندنم تەواو کردووە.

٦. مەخوارن کڕییە.

٧. هەر بە تێکۆشان دەگەینە ئامانج.

٨. کوردستان هەر ب زانینێ پێش دکەڤیت.

٩. بەرهەمی ڕاپەڕین دیارە.

١٠. کارێ قوتابی خوێندنە.

١١. دەست پێکردنی پرۆژەکە دواخرا.

## خستنه ڕوو:

لەمەو پێش بۆمان ئاشكرابوو كە چاوگ وەكو ناوێك لەناو ڕستەدا بەكاردێت، چونكە تايبەتييەكانی (سيفەتەكانی) ناو وەردەگرێتو ئەركەكانی ناو لەڕستەدا دەبينێت.

ئـ- تايبەتييەكانی ناو وەردەگرێت كە ئەمانەن: چاوگ وەكو ناو دەتوانرێت بكرێت بە ناسراو بە هۆی ئامرازی پێ ناسين (ەكە). هەروەها دەتوانرێت بكرێت بە كۆی ناسراو بەهۆی ئامرازی كۆ (ان) كە دەخرێتە دوای ئامرازی پێ ناسين (ەكە). هەروەها دەتوانرێت تەواو بكرێت بە (ناو، جێناو، هاوەڵناوی چۆنی). بۆ دەرخستنی ئەم ڕاستييانە ئەگەر سەيری ڕستەكانی بەشی (ئـ) بكەين دەبينين:

١. لەڕستەی يەكەمدا وشەی (نووسينەكە) چاوگێكی ناسراوە بەهۆی ئامرازی پێ ناسين (ەكە) بووە بە ناسراو.

٢. لە ڕستەی دووەمدا وشەی (نووسينەكان) چاوگێكی كۆی ناسراوە بەهۆی ئامرازی كۆ (ان) كە خراوەتە دوای ئامرازی پێ ناسين (ەكە).

٣. لەڕستەی سێيەمدا وشەی (ئاخفتن) چاوگەو بە هاوەڵناوی چۆنی (باش)، تەواو كراوە.

٤. لەڕستەی چوارەمدا وشەی نووسين چاوگەو تەواو كراوە بە ناوی هێمن.

٥. لەڕستەی پێنجەمدا وشەی هاتن چاوگەو تەواو کراوە بە جێناوی کەسیی (وان).

ب- چاوگ ئەرکەکانی ناو دەبینێت لە ڕستەدا، ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) بکەین، دەبینین هەر چاوگێك ئەرکێکی بینیوە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

لەڕستەی یەکەمو دووەمدا چاوگی (نقستن، سووتان) هەر یەکەیان نیهادە لە ڕستەی خۆیدا، چونکە خەبەرێك یا سیفەتێك دراوەتە پاڵ هەر یەکێکیان، لەڕستەی سێیەمو چوارەمدا چاوگی (خوێندن، کوشتن) بکەرن، چونکە هەر یەکەیان کارێکی دراوەتە پاڵ.

لەڕستەی پێنجەمو شەشەمدا چاوگی (خوێندن، خوارن) بەرکارن، چونکە هەر یەکەیان مانای کاری تەواو کردووەو کاریگەرێتی کاریشی کەوتۆتە سەر. لەڕستەی حەوتەمو هەشتەمدا چاوگی (تێکۆشان، زانین) تەواوکەری بە یاریدەن، لە ڕستەی نۆیەمدا چاوگی (ڕاپەڕین) ئەرکی تەواوکردنی ناوی (بەرهەم)ی بینیوە. لەڕستەی دەیەمدا چاوگی خوێندن ئەرکی تەواوکردنی کاری ناتەواوی (ە)ی بینیوە. لەڕستەی یازدەمدا چاوگی (دەست پێکردن) ئەرکی جێگری بکەری بینیوە. لە ئەنجامدا ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە چاوگ تایبەتییەکانو ئەرکەکانی ناو لەڕستەدا وەردەگرێتو جێ بەجێی دەکات، لەبەر ئەوە چاوگ وەکو ناوە.

## دەستوور:

**چاوگ لەناو ڕستەدا وەکو ناوێك بەکاردێت، چونکە:**

**ئـ- تایبەتییەکانی ناو وەردەگرێت، دەتوانرێت بکرێت بە (تاکی ناسراو، کۆی ناسراو، تەواوکرا بێت بەناو یان بەجێناو یان بە هاوەڵناوی چۆنی).**

**ب- ئەرکەکانی ناو دەبینێت، دەبێت بە (نیهاد، بکەر، بەرکار، تەواوکەری بەیاریدە، تەواوکەری (دیارخەری) ناو، تەواوکەری کاری ناتەواو، جێگری بکەر) لەڕستەدا.**

## ڕاهێنان (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا چاوگەکان دەربهێنەو ئەرکەکانیان دیار بخە:

١. بژارکردن بۆ کشتوکاڵ بە سوودە.

٢. هێنان بردنەوەی دەوێت.

٣. ب ئاڤا کرنا گوندان ژێر خانا ئابووری ڤەدەژێتەوە.

٤. بریا خوێندنم تەواو بکردایە.

٥. کارگەی چنین لە هەولێر هەیە.

٦. ئەڤە کەنگی نڤیسینە؟

٧. کردنەوەی پیشانگاکە دوا خرا.

## ڕاهێنان (٢)

چاوگی (یارمەتیدان) لەڕستەدا بەکاربهێنە بەمەرجێك هەموو ئەرکەکان ببینێت.

## ڕاهێنان (٣)

لەڕستەی (ڕاپەڕین ئێمەی گەیاندە سەرکەوتن)

أ- وشەی (ڕاپەڕین) چییە؟ چۆن دروست کراوە؟ ئەرکی چییە؟

ب- وشەی (ئێمە) شی بکەوە.

ج-وشەی (سەرکەوتن) چییە؟ چ جۆرێکە؟ ئەرکی چییە؟

د- (ی) لە دوای وشەی (ئێمە) چییە؟ ئەرکی چییە؟

هـ- وشەی (ڕاپەڕین) لە ڕستەیەکی تردا ببێتە بەرکار.

و- وشەی (سەرکەوتن) بکە بە کۆی ناسراوو لەڕستەیەکی تردا ببێتە نیهاد.

ز- (ە)ی دوای وشەی گەیاند چییە؟

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١. ئەنجامی هەڵبژاردنەکەیان ڕاگەیاند.

٢. خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

↑ ↓

| | | |
|---|---|---|
| وان | : | ئەوان. |
| ژان: ئێش | : | ئازار |
| خۆزی | : | خۆزگە |
| گیرۆ بوو | : | دواخرا |
| خۆزی | : | بریا |
| کەنگی؟ | : | کەی؟ |

# ڕەگـــــــی کار

| (١) | (٢) | (٣) |
|---|---|---|
| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
| کێلان | کێلا | کێل |
| کوتان | کوتا | کوت |
| پیڤان | پیڤا | پیڤ |
| کڕین | کڕی | کڕ |
| مردن | مرد | مر |
| خوێندن | خوێند | خوێن |
| ڕەڤین | ڕەڤی | ڕەڤ |
| گرتن | گرت | گر |
| دانیشتن | دانیشت | دانیش |
| چوون | چوو | چ |
| بوون | بوو | ب |

**خستنە ڕوو:**

١. پێشتر زانیمان کە چاوگ کردەوەیەك دەردەخاتو کردەوەکە نادرێتە پاڵ کەسێك یا شتێك، هەروەها کاتی تێدا دیاری نییە، چاوگەکان بە پیتی پێش (ن)ی چاوگ دەناسرێنو دەکرێن بە پێنج

بەشەوە چاوگی (ئەلفی، یائی، دالی، تائی، واوی)* . واتە چاوگ بە یەکێك لەم نیشانانە (ان، ین، دن، تن، وون) کۆتایی دێتو بە هەر یەکێکیان دەوترێت نیشانەی چاوگ. بە پیتی (ن)ە کەش دەگوترێت (نوونی چاوگ) وەکو لە ستوونی یەکەمدا خراوەتە بەر چاو. (کێلاّن، کوتان، پیڤان، کڕین، مردن، خوێندن، ڕەڤین، گرتن، دانیشتن، چوون، بوون).

٢. ئەگەر سەیری وشەکانی ستوونی دووەم بکەین (کێلاّ، کوتا، پیڤا، کڕی، مرد، خوێند، ڕەڤی، گرت، دانیشت، چوو، بوو).

دەبینین هەموویان لە چاوگەکانی ستوونی یەکەم وەرگیراون، بەلابردنی نوونی چاوگ دروست کراون، بە ئەمانە دەگوترێت (قەد) یا (کاری ڕابووردووی نزیك)، کە دەبێتە بنچینەی دروستکردنی هەموو بەشەکانی تری کاری ڕابوردوو، کە لەمەو دوا دەیان خوێنین.

٣. ئەگەر سەیری وشەکانی ستوونی سێیەم بکەین (کێلّ، کوت، پیڤ، کڕ، مر، خوێن، ڕەڤ ، گر، دانیش، چـ، ب) دەبینین هەموویان لە چاوگەکانی ستوونی یەکەم وەرگیراونو پێیان دەگوترێت ڕەگی کار، بەشی هەرە زۆری ڕەگی کار بە تەنیا بەکار نایەتو مانای تەواو نا بەخشێت، بەلاّم دەبێتە سەرچاوە بۆ دروست کردنی کاری (ڕانەبوردوو، داخوازی)و گەلێك وشەی تر.

---

* لە کرمانجی ژووریدا چاوگ هەیە نیشانەی (ر)و کۆتایی بە (رن) دێت، وەك: (برن، کرن، مرن، خوارن).

## دەستوور:

ڕەگی کار: ئەو بەشەیە کە لەچاوگ وەردەگیرێتو واتای چاوگ هەڵدەگرێت، بەشی هەرە زۆری ڕەگی کار بە تەنیا بەکار نایەتو واتای تەواو نابەخشێت، بەڵام دەبێتە سەرچاوە بۆ دروست کردنی کاری (ڕانەبردوو، داخوازی )و گەلێك وشەی تری زمانەکەمان.

## دۆزینەوەی ڕەگی کار

(١)

| | چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
| --- | --- | --- | --- |
| ئـ- | هێنا | هێنا | هێن |
| | پیڤان | پیڤا | پیڤ |
| | کێڵان | کێڵا | کێڵ |
| | شێلان | شێلا | شێل |
| | کێشان | کێشا | کێش |
| ب- | خنکان | خنکا | خنکێ |
| | برژان | برژا | برژێ |
| | زان | زا | زێ |
| | شکان | شکا | شکێ |
| | دڕان | دڕا | دڕێ |

### خستنە ڕوو:

ئـ- کاتێك سەیری چاوگەکانی بەشی (ئـ) دەکەین (هێنان، پیڤان، کێڵان، شێلان، کێشان) دەبینین هەموو چاوگی تێپەڕی (ئەلفی)ن ڕەگی کار لەم چاوگانە بەلابردنی نیشانەی چاوگ (ان) دروست دەکرێت، ئەوەی دەمێنێتەوە پێی دەگوترێت ڕەگی کار وەکو (هێن، پیڤ، کێڵ، شێل، کێش).

ب- کاتێك سەیری چاوگەکانی بەشی (ب) دەکەین (خنکان، برژان، زان، شکان، دڕان) دەبینین هەموویان چاوگی تێنەپەڕی (ئەلفی)ن، ڕەگی

کار لەم چاوگانە دروست دەکرێت بە لابردنی (ن)ی چاوگو گۆڕینی پیتی (ا) بۆ پیتی (ێ) وەکو (خنکێ، برژێ، زێ، شکێ، دڕێ).

**تێبینی:** چاوگی (لێنان) چاوگێکی ئەلفی تێپەڕە، ڕەگی کاری لێ دروست دەکرێت بە ڕێگای چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ بەڵام ڕەگی کار لە چاوگی (شیان، گریان، ژیان) لەم دەستوورە لادەدەن، ڕەگی کار لە چاوگی (شیان- شێ) (گریان- گری) (ژیان- ژی) ئەگەر بە پێی دەستوور بووایە، دەبوو بگوترێت (شیێ، گریێ، ژیێ) هەروەها ڕەگی کار لە چاوگی (مان) دەبێتە (مێن) ئەمەش لە دەستوور لای داوە، لەوانەیە چاوگەکە لە بنەڕەتدا (ماندن)بێت، ئەمجا ڕەگی کار دەبێتە (مێن).

**دەستوور:**

دۆزینەوەی ڕەگی کار لە چاوگە ئەلفییەکان بەم شێوەیە دەبێت:

ئ - ئەگەر چاوگی ئەلفی تێپەڕ بوو ڕەگی کار دروست دەکرێت، تەنها بە لابردنی نیشانەی چاوگ (ان) ئەوەی دەمێنێتەوە ڕەگی کارە.

ب- ئەگەر چاوگی ئەلفی تێنە پەڕ بوو ڕەگی کار دروست دەکرێت بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ و گۆڕینی پیتی (أ) بۆ (ێ).

# دۆزینەوەی ڕەگی کار

(٢)

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
| --- | --- | --- |
| بڕین | بڕی | بڕ |
| نڤیسین | نڤیسی | نڤیس |
| کڕین | کڕی | کڕ |
| بەخشین | بەخشی | بەخش |
| زانین | زانی | زان |
| ڕەڤین | ڕەڤی | ڕەڤ |
| فڕین | فڕی | فڕ |
| لەرزین | لەرزی | لەرز |
| زڤڕین | زڤڕی | زڤڕ |

**خستنە ڕوو:**

ئەگەر سەیری چاوگەکان بکەین (بڕین، نڤیسین، کڕین، بەخشین، زانین، ڕەڤین، فڕین، لەرزین، زڤڕین) دەبینین هەموویان یائین، هەندێکیان، تێنەپەڕن وەك: (ڕەڤین، فڕین، لەرزین، زڤڕێن) ڕەگی کار لەم چاوگانە (تێپەڕو تێنەپەڕ) وەك یەك دروست دەکرێت ئەویش بە لابردنی نیشانەی چاوگ (ین) ئەوەی دەمێنێتەوە ڕەگی کارە.

**دەستوور:**

**دۆزینەوەی ڕەگی کار لە چاوگی یائیی تێپەڕو تێنەپەڕ بە لابردنی نیشانەی چاوگ ( ین ) دەبێت.**

# دۆزینەوەی ڕەگی کار

(٣)

| | چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|---|
| ئـ- | چوون | چوو | چـ |
| | بوون | بوو | ب |
| ب- | دروون | دروو | دروو |
| | گروون | گروو | گروو |
| | جوون | جوو | جوو |
| | سوون | سوو | سوو |

**خستنە ڕوو:**

ئـ – کاتێك سەیری چاوگەکانی بەشی (ئـ) دەکەین (چوون، بوون) دەبینین چاوگی (واو)ی تێنەپەڕن، ڕەگی کار لەم چاوگانە بە لابردنی نیشانەی چاوگ دروست دەکرێت، واتە لابردنی (وون)و ئەوەی دەمێنێتەوە ڕەگی کارە وەك (چـ، ب).

ب– کاتێك سەیری چاوگەکانی بەشی (ب) دەکەین (دروون، گروون، جوون، سوون) دەبینین ئەمانەش چاوگی (واوی)نو تێپەڕن ڕەگی کار لەم چاوگانە تەنها بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ دروست دەکرێت وەك: (دروو، گروو، جوو، سوو). لێرەدا ڕەگی کار لەگەڵ قەدی چاوگ لە ڕووی دروست کردنەوە وەك یەکن.

## دەستوور:

دۆزینەوەی ڕەگی کار لەچاوگی واوی بەم شێوەیەیە :

ئـ- لە چاوگی واوی تێنە پەڕدا ڕەگی کـار دروسـت دەکرێـت بـە لابردنـی نیـشانەی چاوگ کە ( وون )ە.

ب- لە چاوگی واوی تێپەڕدا ڕەگی کار دروست دەکرێـت تـەنها بـە لابردنـی پیتـی ( ن )ی چاوگ.

# دۆزینەوەی ڕەگی کار

(٤)

ئـ/

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| فرۆشتن | فرۆشت | فرۆش |
| ڕێستن | ڕێست | ڕێس |
| کەڤتن | کەڤت | کەڤ |
| گرتن | گرت | گر |
| خوێندن | خوێند | خوێن |
| مردن | مرد | مر |
| لێ بووردن | لێ بوورد | لێ بوور |

ب/

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| سپاردن | سپارد | سپێر |
| چاندن | چاند | چێن |
| ناردن | نارد | نێر |
| سەندن | سەند | سێن |
| براژندن | برژاند | برژێن |
| ستاندن | ستاند | ستێن |
| پالاوتن | پالاوت | پالێو |
| ڤەشارتن | ڤەشارت | ڤەشێر |

پ/

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| خواستن | خواست | خواز |
| گەستن | گەست | گەز |
| پاراستن | پاراست | پارێز |
| کوشتن | کوشت | کوژ |
| هاڤێشتن | هاڤێشت | هاڤێژ |
| چێشتن | چێشت | چێژ |
| ڕێشتن | ڕێشت | ڕێژ |

ت/

| چاوگ | قەدی چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|---|
| نووستن | نووست | نوو |
| ڕۆیشتن | ڕۆیشت | ڕۆ |
| خواردن | خوارد | خۆ |
| شووشتن | شووشت | شۆ |
| خستن | خست | خە |
| بردن | برد | بە |
| کردن | کرد | کە |
| هێشتن | هێشت | هێڵ |
| ویستن | ویست | وێ |
| گۆتن | گۆت | لێ- بێژ |
| دان | دا | دە |

## خستنه ڕوو:

دۆزینەوەی ڕەگی کار لە چاوگی (تائی یا دالی) بە چەند شێوەیەکی جیاواز دەبێت:

ئـ - شێوەی یەکەمیان لە هەندێك چاوگی (تائی یا دالی) وەکو نموونەکانی بەشی (ئـ) کە چاوگەکان (فرۆشتن، ڕێستن، کەڤتن، گرتن، خوێندن، مردن، لێ بووردن) هەندێکیان تێپەڕن، هەندێکیان تێنەپەڕن، ڕەگی کار لەم چاوگانەدا یەکسەر بە لابردنی نیشانەی چاوگ (تن یا دن) دروست دەکرێت، بەڵام ژمارەی ئەم بەشەیان کەمە.

ب- شێوەی دووەمیان لە هەندێك چاوگی (تائی یا دالی) وەکو نموونەکانی بەشی (ب) چاوگەکان (سپاردن، چاندن، ناردن، سەندن، برژاندن، ستاندن، پاڵاوتن، ڤەشارتن) دۆزینەوەی ڕەگی کاری ئەو چاوگانەی کە پیتی پێش پیتە نەبزوێنەکەی پێش نیشانەی چاوگ پیتی بزوێنی (ا، ە) بوو، ڕەگی کار بەم شێوەیە دروست دەکرێت، نیشانەی چاوگ (تن، یا دن) لادەبرێن، پیتی بزوێنی (ا، ە) کە لەپێش پیتە نەبزوێنەکەیە دەگۆڕێت بۆ پیتی بزوێنی (ێ) وەك (سپێر، چێن، نێر، سێن، برژێن، ستێن، پاڵێو، ڤەشێر).

پ- شێوەی سێیەم لەهەندێك چاوگی تائیدا وەکو نموونەکانی بەشی (پ) چاوگەکان (خواستن، گەستن، پاراستن، کوشتن، هاڤێشتن،

ڕێشتن، چێشتن) دۆزینەوەی ڕەگی کار لەم چاوگانەی کە پیتی پێش نیشانەی چاوگ (تن) (س، ش) بوو، بەم شێوەیە دەبێت، نیشانەی چاوگ (تن) لا دەبرێت ئینجا پیتی (س) دەگۆڕێت بۆ پیتی (ز)، پیتی (ش) دەگۆڕێت بۆ پیتی (ژ) وەکو (خواز، پارێز، کوژ، هاڤێژ، ڕێژ، چێژ).

ت – شێوەی چوارەم لەهەندێك چاوگی تائی یا دالی وەکو نموونەکانی بەشی (ت)، چاوگەکان (گەیشتن، نووستن، خواردن، شووشتن، خستن، ڕۆیشتن، بردن، کردن، هێشتن، ویستن، گوتن، دان) دۆزینەوەی ڕەگی کار لەو چاوگانە دەستورێکی تایبەتی نییە، بەڵکو دەبێت لەبەر بکرێن، ژمارەی ئەم چاوگانە کەمە وەك ڕەگەکان (گە، نوو، خۆ، شۆ، خە، ڕۆ، بە، کە، هێڵ، وێ، ڵێ، بێژ، دە).

جگە لەو شێوانەی کە باسمان کردن چاوگی تائی هەیە ڕەگی کاری لێ دروست دەکرێت تەنها بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ وەك:

| چاوگ | ڕەگی کار |
|---|---|
| بیستن | بیست |
| بەستن | بەست |
| پەرستن | پەرست |

## دەستوور:

**دۆزینەوەی ڕەگی کار لە چاوگی تائیو دالی بەم شێوەیەیە :**

**ئـ - لە بەشێکی چاوگی تائی یا دالی ڕەگی کار دروست دەکرێت بە لابردنی نیشانەی چاوگ (تن، دن).**

**ب - لە بەشێکی تری چاوگی تائی یا دالی بە تایبەتی لەو چاوگانەی کە پیتی پێش پیتە نەبزوێنەکەی پێش نیشانەی چاوگ (أ، ە)یە، ڕەگی کار دروست دەکرێت بە لابردنی نیشانەی چاوگ (تن، دن) لەگەڵ گۆڕینی پیتی (أ، ە) بۆ پیتی (ێ).**

**پ- لە بەشێکی تری چاوگی (تائی) دا بەتایبەتی لە هەندێك لەو چاوگانەی کە پیتی پێش نیشانەی چاوگ (س، ش)ە ڕەگی کار دروست دەکرێت بە لابردنی نیشانەی چاوگ (تن) لەگەڵ گۆڕینی پیتی (س) بۆ پیتی (ز)، و پیتی (ش) بۆ پیتی (ژ).**

**ت - لە بەشێکی تری چاوگی تائیو دالی ڕەگی کار بێ دەستوور دروست دەکرێت، بەڵکو دەبێت لەبەر بکرێن، بەڵام ژمارەیان کەمە. چاوگی تائی هەیە ڕەگی کاری لێ دروست دەکرێت تەنها بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ.**

## ڕاهێنان (١)

لەم چاوگانەی خوارەوە ڕەگی کار دروست بکەو چۆنیەتی دروست کردنەکەی دیار بخە:

(پسان، ژیان، سووان، گریان، سوون، لێنان، راپەڕاندن، مانەوە، بارین، مەیین).

## ڕاهێنان (٢)

ئەم ڕەگی کارانە لە چ چاوگێك دروست کراون و چۆن؟

(بێژ، مێن، وێ، بە، ڕۆ، کوژ، پارێز)

## ڕاهێنان (٣)

پێنج چاوگ بهێنەوە کە ڕەگی کارو قەدی چاوگ وەك یەك بن لەڕووی دروستکردنەوەو چۆنیەتی دروستکردنەکەش دیار بخە.

## ڕاهێنان (٤)

وەڵامی ئەمانە بدەرەوەو نموونە بهێنەوە:

ئـ- چۆن ڕەگی کار لە چاوگی واوی تێنەپەڕ دروست دەکرێت؟

ب- چۆن ڕەگی کار لە چاوگی ئەلفی تێنەپەڕ دروست دەکرێت؟

پ- کەی پیتی (س) دەگۆڕێت بۆ (ز) و پیتی (ش) دەگۆڕێت بۆ (ژ) لە دروست کردنی ڕەگی کاردا.

ت- کەی پیتی (أ،ە) دەگۆڕێت بۆ (ێ) لەکاتی دروست کردنی ڕەگی کاردا.

## ڕاهێنان (٥)

بە ئارەزووی خۆت چوار دێڕە هۆنراوە بهێنەوە بە مەرجێك لەهەر دێرێکدا چاوگ هەبێت، لە چاوگەکە ڕەگی کار دروست بکە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

↑ ↓

| | |
|---|---|
| کوتان | : دەرزی (شرینقە) لێدان. |
| هەڵاتن | : ڕەڤین. |
| سوڕانەوەو گەڕانەوە | : زڤڕین. |
| جوون | : جوین. |
| سوون | : هسوین. |
| پاڵاوتن | : وێراندن. |
| چێشتن | : کێشان/ تامکرن. |
| هێشتن | : هێلان. |
| پسان | : بزدیان، پچڕان. |

## چاوگ سەرچاوەی دارشتنی کارە

ئـ/

١. خوێندن چاوی مرۆڤ دەکاتەوە.
٢. نڤیسین بۆمە پێویستە.
٣. زانین ڕووناکییە.
٤. ئەم هەر ب یەکگرتنێ دگەهینە ئارمانجێ.
٥. ئاوەدان کردنەوەی گوندەکان ئەرکێکی کوردایەتییە.
٦. پاراستنی دەستکەوتەکان نیشانەی دڵسۆزییە.

ب/

١. ئەوان وانەیان خوێند.
٢. ئازادی چیرۆك نڤیسی.
٣. ئێمە پرسیارەکەمان زانی.
٤. هەموو کۆمەڵەکان یەکیان گرت.
٥. گوندەکانمان ئاوەدان کردەوە.
٦. دارستانەکانیان پاراست.

**خستنە ڕوو:**

ئـ – کاتێك سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەکەین، دەبینین وشەکانی (خوێندن، نڤیسین، زانین، یەکگرتن، ئاوەدان کردنەوە، پاراستن)

هەموویان چاوگن‌و وەکو ناو لەڕستەدا بەکار هێنراون، هەر یەکێك لەم چاوگانە کردەوەیەك دیار دەخات، بەڵام کردەوەکە نەدراوەتە پاڵ کەسێك یا شتێك، هەروەها کاتی دیاری کراوی تێدا نابینرێت.

ب- کاتێك سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) دەکەین، دەبینین وشەی (خوێند، نقیسی، زانی، یەکگرت، ئاوەدان کردەوە، پاراست) هەموویان لێرەدا کارن‌و لە چاوگەکانی بەشی (أ) وەرگیراون‌و لێیان نزیکن، هەر یەکێك لەم کارانە، کردەوەیەکی پیشان داوەو خراوەتە پاڵ کەسێك یا شتێك کە بکەرەکەیەتی لەکاتێکی دیاری کراودا، کەکاتی ڕابووردووە. کەواتە دەبێت هەر کارێك ئەم سێ شتەی تێدا بێت:

١. کردەوەیەك پیشان بدات.
٢. کردەوەکە بخرێتە پاڵ کەسێك یا شتێك کە بکەرەکەیەتی.
٣. کاتێکی دیاری کراوی تێدا بێت.

ئەگەر جارێکی تر بە وردی سەیری کارەکان بکەین لەڕووی دارشتنیانەوە (دروست کردنیانەوە)، دەبینین هەر یەکێك لەم کارانە لە چاوگێك وەرگیراوە یا بلێین دروست کراوە کە لەڕستەکانی بەشی (أ) هاتوون ئەمەش بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ، کەواتە دەتوانرێت کاری ڕابووردوو لە چاوگ دروست بکرێت، بۆیە چاوگ بە سەرچاوەو بناغەی دارشتنی کار دادەنرێت.

**دەستوور:**

**چاوگ بە سەرچاوەی دارشتنی کار دادەنرێت، چونکە دەتوانرێت کاری ڕابووردوو لە چاوگ دروست بکرێت بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ، هەر کارێك دەبێت ئەم سێ شتە بگەیەنێت:**

1. **کردەوەیەك پیشان بدات.**
2. **کردەوەکە بخرێتە پاڵ کەسێك یا شتێك کە بکەرەکەیەتی.**
3. **کاتێکی دیاری کراوی تێدا هەبێت.**

## ڕاهێنان (١)

شەش چاوگ بهێنەوە، ئینجا کاری ڕابووردوو لە چاوگەکان دروست بکەو لەڕستەدا بەکاریان بهێنە، جارێك وەکو چاوگ‌و جارێك وەکو کار.

## ڕاهێنان (٢)

جیاوازی لەنێوان چاوگ‌و کاردا چییە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان (٣)

پارچەیەك لەسەر (بەهاری کوردستان ڕەنگینە) بنووسە، ئینجا کارەکان دەست نیشان بکەو بیانگێڕەوە بۆ چاوگەکانیان.

## ڕاهێنان (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١- مە خوێندن تەواو کر.

٢- ژووری دانیشتنەکەیان پاك کردەوە.

٣- نووسینەکانی ئێوەم خوێندەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| ↓ | | ↑ |
|---|---|---|
| ئێمە | : | مە |
| لابردن | : | ڤەدان / لادان |

# دەمەكانی كار

## ١- كاری ڕابوردوو (بوری)

**بەختیار گوتی: ڕۆژێك پاش نیوەڕۆ چووم بۆ ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی، كە مەڵبەندێكی ڕۆشنبیرییە لە هەولێرێ، پڕێتی لە ڕۆژنامەو گۆڤارو كتێبی نایاب و دەگمەن. چەند كەسێكم بینی، كە هەریەكەیان كتێبێكی لە كتێبخانەكە هێناوە، لە شوێنێك دانیشتووە، خۆی بە خوێندنەوەی كتێبەكە خەریك كردووە، ناوە ناوە مامۆستاو نووسەرو ڕۆشنبیران دەهاتنە ژوورەوە، بە دوای كتێب دەگەڕان، كتێبی باش و دەگمەنیان هەڵدەبژاردو بە وردی دەیان خوێندەوە، یەكێك كە لە تەنیشتم دانیشت بوو، گوتارێكی دەربارەی مێژووی گەلی كورد نووسی بوو، لە شوێنێكی دوور هات بوو، گوتی بەڕاستی ئەم ماڵی شەرەفخانی بەتلیسییە شوێنێكی پیرۆزە، خۆزگە مەڵبەندی ڕۆشنبیریی وەهایان لە شوێنی تری كوردستان بكردایەوە.**

## خستنە ڕوو:

ئەگەر سەیری ئەم پارچە نووسینەی سەرەوە بكەین، دەبینین وشەكانی (گوت، چوو، بینی، هێناوە، دانیشتووە، خەریك كردووە، دەهات، دەگەڕا، هەڵدەبژارد، دەخوێندەوە، دانیشت بوو، نووسی بوو، هات بوو، گوت، بكردایەوە). هەموویان كاری ڕابوردوون، هەر یەكەیان كردەوەیەكی پیشان داوەو دراوەتە پاڵ كەسێك یا شتێك، لە كاتی ڕابوردوودا ڕووی داوە، واتە پێش كاتی ئاخاڤتن كارەكە ڕووی داوەو تەواویش بووە، بەڵام ئەگەر سەیری كاتی ڕوودانی كارە ڕابوردووەكان بكەین دەبینین لەیەك جیاوازن.

## دەستوور:

کاری ڕابوردوو: ئەو کارەیە کە کردەوەیەك پیشان دەدات کە لەڕابوردوودا ڕووی داوەو دراوەتە پاڵ کەسێك یا شتێك، کاری ڕابوردووی ڕاگەیاندن (ئاگاداری) بە پێی کات دەکرێت بە چوار بەشەوە:

١. کاری ڕابوردووی نزیك: لەڕووی دروست کردنییەوە لە چاوگ دروست دەکرێت بە لابردنی پیتی (ن)ی چاوگ، وەك:

| چاوگ | کاری ڕابوردووی نزیك |
|---|---|
| هێنان | هێنا |
| نووسین | نووسی |
| دانیشتن | دانیشت |
| خوێندن | خوێند |
| چوون | چوو |

٢. کاری ڕابوردووی تەواو: بەم شێوەیە دروست دەکرێت:

(کاری ڕابوردووی نزیك+ وە) وەك:

هێنا + وە = هێناوە

نووسی + وە = نووسیوە

بەڵام ئەگەر کاری ڕابوردووی نزیك کۆتایی بە پیتی نەبزوێن (ت،د) هاتبوو، پیتی بزوێنی (و) دەخرێتە نێوان کاری ڕابوردووی نزیكو پاشگری (وە) وەك:

دانیشت + و + وە = دانیشتووە

خوێند+ و + وە = خوێندووە

دەتوانرێت لەجیاتی پاشگری (وە) پاشگری (یە) بەکار بێت وەکو:

هێنا + یە = هێنایە

نووسی + یە = نووسی یە.

بەلاَم دیسان ئەگەر کاری ڕابوردووی نزیك كۆتایی بە پیتی نەبزوێن ( ت،د ) هاتبوو، پیتی بزوێنی ( ی ) دەخرێتە نێوانیان وەك:

دانیشت + ی + یە = دانیشتییە

خوێند + ی + یە = خوێندییە

هەروەها لەهەندێك ناوچەی کرمانجی ژووروو بەم شێوەیە دروست دەکرێت:

یا + ڕابوردووی نزیك + ی

یێ + ڕابوردووی نزیك + ی

وەك: یا + هینا + ی = یا هیناى

یێ + چاند + ی = یێ چاندی

**تێبینی:** ئەم چاوگانەی کە پاشگری ( ەوە ) یان پێوایە بەم جۆرە رابردووی تەواو یان لێ دروست دەکرێت.

ئ- لابردنی بوونی چاوگ.

ب- دانانی نیشانەی ( وە ) شوێنی ( ن )ی لابراو.

پ- دانانی ناوبەندی ( ت ) لە نێوان بزوێنەکان

خوێندنەوە ⟵ خوێند + ووە+ ت + ەوە = خوێندووەتەوە

دۆزینەوە ⟵ دۆزی + وە + ت + ەوە = دۆزیوەتەوە

٣. کاری ڕابوردووی بەردەوام بەم شێوەیە دروست دەکرێت:

( دە + ڕابوردووی نزیك )

وەك: دە + هێنا = دەهێنا

دە + نووسی = دەنووسی

دە + وەرگرت = وەردەگرت

دە + دروست کرد = دروست دەکرد

لە کرمانجی ژووروودا لەجیاتی نیشانەی ( دە )، نیشانەی ( د ) بەکاردێت وەك:

د + هێنا = دهێنا

د + چوو = دچوو

د + وەگرت = وەردگرت.

٤. **کاری ڕابوردووی دوور بەم شێوەیە دروست دەکرێت:**

**کاری رابوردووی نزیك + بوو:**

**هێنا + بوو = هێنابوو**

**نووسی + بوو = نووسی بوو**

**چوو + بوو = چوو بوو**

**وەرگرت + بوو = وەرگرت بوو**

**تێبینی: ١. کاری ڕابووردوو بە ئامرازی (نە) دەکرێت بە نەرێ.**

**٢. کاری ڕابووردووی نزیکی دانانی بەم شێوەیە دروست دەکرێت.**

**(کاری ڕابوردووی نزیك + با) وەك:**

**هات+ با = هاتیا**

**خوێند+ با = خوێندبا**

## ڕاهێنان (١)

لەم چاوگانەی خوارەوەدا کاری ڕابوردووی نزیكو دوور دروست بکە:

( پێشکەوتن، نڤیسین، وەرگرتن، ئاڤدان، داخستن )

## ڕاهێنان (٢)

بەچەند شێوە دەتوانیت کاری ڕابوردووی تەواو لەم چاوگانە دروست بکەیت؟

(کێڵان، دروست کردن، چاندن، هاتن، بەخشین)

## ڕاهێنان (٣)

لەم چاوگانەی خوارەوەدا کاری ڕابووردووی بەردەوامی ڕاگەیاندنو کاری ڕابوردووی نزیکی دانانی دروست بکەو لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە.

(سەرکەوتن، هەڵکێشان، یارمەتی دان، فرۆشتن )

## ڕاهێنان (٤)

لەم پارچە نووسینەی خوارەوەدا هەر چ کاری ڕابوردوو هەیە دەری بهێنەو جۆرەکەی دیار بخە:

ڕۆژەکا هاڤینێ میرزاو خێزانا خۆ بەرەڤ هاڤینگەها سویلاڤێ چوون، بەری وان سەیرانییان هێزکەك ب دارەکێ ڤەکر بوو، زارۆکێن میرزای کەیفا وان ب هێزکێ هات، چوونە تێداو خۆ هژاند، ل دانگا وان وەرازان، پرەك ل سەر جۆگا ئاڤێ دروست کردبوو، دەمێ میرزا ژ پرێ دەرباز دبوو گازییەك بهیست، میرزای غاردا، دیت، زارۆکەکێ د گۆمەکا ئاڤێدا مەلەڤانیان دکەتو نزیکە بخەنکێت، میرزای خۆ هاڤێتە ئاڤێو ئەو زارۆك ڕزگار کر، پشتی هندێ میرزا ڤەگەڕیا، دیت، کوڕێ وی یێ نڤستی، ل ڤەگەڕیانێ نازێ گۆتە بابێ خۆ خۆزی هەڤالا من هێرۆ ژی دگەل من هاتبا، دا مە پێکڤە یاری کربانو چوو باینە د هێزکێدا.

## ڕاهێنان (٥)

لەم ڕستەی خوارەوەدا:

**(دوێنی پەخشان ڕۆژنامەی دەخوێندەوە).**

١. وشەی (دوێنیٚ) چییەو ئەرکی چییە؟

٢. وشەی (ڕۆژنامە) شی بکەوە.

٣. کاری (دەخوێندەوە) کام جۆری کاری ڕابوردووە؟ چۆن دروست کراوە؟

٤. بکەری ڕستەکە دیار بخە.

٥. لە کاری (دەخوێندەوە) کاری ڕابوردووی تەواو دروست بکە.

٦. لە کاری (دەخوێندەوە) کاری ڕابوردووی دوور دروست بکە.

٧. لەکاری (دەخوێندەوە) کاری ڕابوردووی نزیکی دانانی دروست بکەو لەڕستەدا بەکاری بهێنە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| نایاب | : | گەلەك باش |
| دەگمەن | : | کیم و بیٚ هاڤتا |
| خەریك کردووە | : | مژویل کریە |
| ناوە ناوە | : | بەین بەین / هەیام هەیام |
| بکردایە | : | ڤەکریا |
| پێش ئەوان | : | بەری وان |
| هێزکەك | | جۆلانە، لەیلوك |
| زارۆکێن میرزای | | مندالەکانی میرزا |

| | |
|---|---|
| ل دانگا | له کەناری |
| پرەك | پردێك |
| دەمێ | کاتێ |
| دوهی | دوێنێ |
| سەیرانییان | گەشتیاران |
| ل ڤەگەڕیانێ | لە گەڕانەوەی دا |
| وەڕازان | : درێژ بوون، ڕاکشان |

## ٢- كاری ڕانەبوردوو ( نهۆ )

**١. چی دەکەیت؟**

**- نامە دەنووسم ئەی تۆ چی دەکەیت؟**

**- من ئێستا چیرۆك دەنووسم.**

**- ئەی ئێوارێ چی دەنووسێت.**

**- ئێوارێ گوتارێك بۆ ڕۆژنامە دەنووسم.**

**- مانگێکی تر گوتارێکی تر دەنووسم.**

**٢. جوتیاری زەڤیا خۆ دکێلیت، پشتی بەداوی دهێت، دێ گەنمێ چینیت، ئـەڤ ساله نۆکان ناچینیت، ژ بەرکو دەمێ هەڵدکێشیت، دێ ماندوو بیت.**

## خستنه ڕوو:

کاتێك سەیری ڕستەکانی بەشی ژمـارە (١)و پارچـە نووسـینی ژمـارە (٢) دەکـەین، دەبیـنین وشـەکانی (دەکـەیت، دەنووسـم، دەنووسـێت، دکێلیـت، دهێـت، دێ چـینیت، ناچـینیت، دێ بیـت) هـەموویان کـاری ڕانـەبوردوون، هـەر یەکـەیان کردەوەیـەك پیـشان دەداتو دەدرێتـە پـاڵ کەسـێك یـا شـتێك لـە کـاتی ئاخـاڤتن یـا لـە دوای ئاخـاڤتن دەسـت پـێ دەکات.

کاری ڕانەبردوو بە پێی کاتەوە دەکرێت بە دوو بەش:

ئـ- کاری ڕانەبردووی ئێستا (نهۆ).

ب- کاری ڕانەبوردووی ئاینده (داهاتوو).

ئـ- کـاری ڕانـەبوردووی ئێـستا کردەوەیـەك پیـشان دەدات کـە لـەکاتی ئاخـاڤتن یـا لـەدوای ئاخـاڤتن دەسـت پـێ دەکـات، بـەم شـێوەی خوارەوە دروست دەکرێت.

(دە + ڕەگی کار + جێناوی لکاو)

دە + چ + یت = دەچیت

دە + نووس + م = دەنووسم.

لــە کرمــانجی ژووروودا لــەجیاتی نیــشانەی (دە)، نیــشانەی (د) بەکاردێت بۆ کاری ڕانەبردووی ئێستا وەکو:

(د + ڕەگی کار + جێناوی لکاو )

د + ڕەگی کار + م = دچم

د + نڤیس + ین = دنڤیسین

کاری ڕانەبوردووی ئێستا لـە کرمـانجی خـوارووdا بـەهۆی هاوەڵکـاری کاتییـەوە دەردەکـەوێت وەکـو (ئێـستا، وا، ئـەوا) کـە دەچـنە پـێش کاری ڕانەبوردوو. وەك:

ئێستا دەچم بۆ قوتابخانە

وا دەڕۆم بۆ ماڵەوە.

ئەوا دەچن بۆ سەیران.

ب- کاری ڕانەبوردووی ئایینده کردەوەیـەك پیشان دەدات کـە لـەدوای ئاخـاڤتن یەکسەر دەسـت پـێ ناکـات بـەلکو لـە ئایندەیـەکی دوور دەست پێ دەکات. ئینجا لە شێوەی کرمانجی خـواروو نیـشانەیەکی

تایبەتی نییە کە جیای بکاتەوە لە کاری ڕانەبوردووی ئێستا واتە هەر وەکو ئەو پێك دێت:

(دە + ڕەگی کار + جێناوی لکاو )

دیسان بەهۆی هاوەلکاری کاتییەوە دەردەکەوێت وەکو ( لەمەودوا، مانگێکی تر، ساڵێکی تر... ) کە دەچنە پێش کاری ڕانەبوردوو.

بەڵام لەشێوەی کرمانجی ژووروو نیشانەیەکی تایبەتی هەیە کە جیای دەکاتەوە لە کاری ڕانەبوردووی ئێستا، واتە کاری ڕانەبوردووی ئاییندە بەم شێوەیە دروست دەکرێت:

(دێ + ڕەگی کار + جێناوی لکاو)

دێ + کڕ + م = دێ کڕم

دێ + چـ + ین = دێ چین

دێ + نڤیس + ن = دێ نڤیسن.

## دەستوور:

**کاری ڕانەبوردوو: ئەو کارەیە کە کردەوەیەك پیشان دەدات لەدوای ئاخاوتن ڕوو دەدات، کردەوەکە دەدرێتە پاڵ کەسێك یا شتێك.**

**کاری ڕانەبوردوو دەکرێت بەدوو بەشەوە، کاری ڕانەبوردووی ئێستاو ئاییندە.**

**لە کرمانجی خواروودا کاری ڕانەبوردوو بەم شێوەیە دروست دەکرێت**

**(دە + ڕەگی کار + جێناوی لکاو )**

**کاری ڕانەبوردووی ئێستاو ئاییندە بە هۆی هاوەڵکاری کاتییەوە لە یەك جیا دەکرێنەوە.**

بەلام لەشێوەی کرمانجی ژووروودا کاری ڕانەبوردووی ئێستا بەم شێوەیە دروست دەکرێت.

(د + ڕەگی کار + جێناوی لکاو)

کاری ڕانەبوردووی ئایندە بەم شێوەیە دروست دەکرێت.

(دێ + ڕەگی کار + جێناوی لکاو).

## تێبینی:

١. کاری ڕانەبوردووی ئێستاو ئایندە بە ئامرازی (نا) دەکرێت بە نەرێ کە شوێنی نیشانەی (دە، د، دێ) دەگرێتەوە.

٢. کاری ڕانەبوردووی ئێستاو ئاییندەی کە خوێندمان، کاری ڕانەبوردووی ڕاگەیاندن بوو، جگە لەمە کاری ڕانەبوردووی دانانی هەیە کە بەم شێوەی خوارەوە پێك دێت.

لە کاری ڕانەبردووی ڕاگەیاندن نیشانەی (دە، د) دەگۆڕێت. بۆ (ب) وەکو:

| کاری ڕانەبوردووی ڕاگەیاندن | کاری ڕانەبوردووی دانانی |
| --- | --- |
| دەخوێنم | بخوێنم |
| دەچم | بچم |
| دەنووسێت | بنووسێت. |

## ڕاهێنان (١)

لەم چاوگانەی خوارەوەدا کاری ڕانەبوردوو دروست بکەو لەڕستەدا بەکاریان بهێنە:

( خواستن، پاراستن، دەرچوون، دانان، وەرگرتن )

## ڕاهێنان (٢)

ئـ- لە شێوەی کرمانجی خواروودا بەهۆی چییەوە کاری ڕانەبوردووی ئێستاو ئایندە لێك جیا دەکەینەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

ب- لە شێوەی کرمانجی ژووروودا چۆن کاری ڕانەبوردووی ئێستاو ئایندە لێك جیا دەکەیتەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنان (٣)

لە ڕستەی (**ڕاپۆرتەکە بە باشی دەنووسم**)

١. بکەری رستە کە دیاربکە. بۆ خراوەتە ئەویٚ؟

٢. کارەکە چ جۆرە کارێکە؟ چۆن دروست کراوە؟

٣. وشەی (بە باشی) شی بکەوە.

٤. کاری ڕستەکە بکە بە نەرێ‌و ڕستەکە سەر لەنوێ بنووسەوە.

٥. وشەی (ڕاپۆرتەکە) شی بکەوە.

٦. دەتوانیت کارەکە بکەیت بە کاری ڕانەبوردووی دانانی؟ چۆن؟

٧. دەتوانیت کارەکە بکەیت بە کاری ڕابوردووی تەواو؟ چۆن؟

## ڕاهێنان (٤)

لەم نووسینەی خوارەوەدا چ کارێکی ڕانەبوردوو هەیە دەری بهێنەو جۆرەکەی دیار بخەو چۆنیەتی دروست کردنی ڕوون بکەوە.

شێرۆ کۆڕەکێ زیرەکە، هەرۆ سپێدێ زوو ژ خەو ڕادبیت، دەستو چاڤێن خۆ ب ئاڤا گەرمو سابوونێ دشۆتو پرچا خۆ جوان شە دکەتو سلاڤێ ل دایكو بابێن خۆ دکەتو دەستێ وان ماچ دکەت، دگەل وان تێشتێ دخۆت، پشتی هینگی خاترا خۆ ژوان دخوازیت، دێ دگەل هەڤالێ خۆ نزاری چیتە قوتابخانێ هەڤالێن وی ب گەرمی پێشوازییێ لێ دکەن.

## ڕاهێنان (٥)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

ئـ- ئەم چیرۆکێ دێ نڤیسین.

ب-هەستیار هۆنراوەکە لە گۆڤارەکەدا بلاو دەکاتەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| ئەی | : | پا |
| ئێستا | : | نهۆ |
| تر | : | دی |
| هەرۆ | : | هەموو ڕۆژ |
| ڕاد بیت | : | هەلدەستێت |
| پشتی هینگی | : | پاش هەینێ |
| پشتی بەدوای دهێت | | پاش بەدوایی هاتنی |

## کاری داخوازی

١. لاوی کورد بخوێنە خوێندن مەرهەمە بۆ زامی گەل

تیشکی زانینە ئەدا ڕۆشن بە ئەستێرەی ئەمــــەل

(دڵزار)

٢. بەبێ باکی بەسەریا ڕامەبوورن حورمەتی بگــرن

گوڵاڵە سوورەی ئەم سەحرایە خوێناوی جگەرتانە.

(ئەحمەد موختار جاف)

٣. مەرحەمەت کە زوو بڕۆ قاسید بڵێ دەردی دڵم

نازی با پوچت ئەکێشم من بە تۆزو گـــەردەوە

(تاهیر بەگی جاف)

٤. گوهـ بدە ئاهو فیغان و لەرز ئوکوڤانــــــە دل

دل ددلدا یێ دسۆژیت پویش و کاو خەرمانە دل

(کەتانی)

٥. هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمـــە

سەر پۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

(بێکەس)

٦. دلبەر تو وەرە جارەك دا ئەز تە ببینم ئەز دل بریــــــــــنم

ئەز ئیرۆ ل سەر تەختی سوخەن پیرێ ئەڤینم دەر ڕوییێ زەمینم

(جگەر خوێن)

## خستنه ڕوو:

ئەگـەر سـەیری دێـره هۆنراوەکـانی سـەرەوە بکـەین، دەبیـنین پەیڤەکانی (بخوێنە، بگرن، ڕامەبوورن، مەرحەمەت کە، بڕۆ، بڵێ، گوهـ بـدە، هەسـتە، تێکۆشـە، فـڕێ دە، وەرە) هـەموویان کـاری داخـوازین و ڕوودانێـك نیـشان دەدەن کـە لـەدوای ئاخـاڤتن یەکسەر ڕوو دەدەن کـە ئاخێوەر واتە کەسی یەکەم داوا لە گوێگر واتە کەسی دووەم– تاك یا کۆ بێت– دەکات بۆ ئەنجامدانی کارێك یەکسەر لەدوای ئاخاڤتن.

ئەگەر سەیری کاری داخوازی بکەین لە ڕووی پێکهێنان واتـە لـەڕووی دروسـت کردنـەوە، دەبیـنین بەشـێوەیەکی گـشتی کـاری داخـوازی بـەم شێوەیەی خوارەوە دروست دەکرێت:

(ب+ ڕەگی کار + جێناوی لکاو)

ب + ڕەگی کار + ە : بۆ کەسی دووەمی تاك:

ب + خوێن + ە = بخوێنە.

ب + نڤیس + ە = بنڤیسە.

ب + ڕەگی کار + ن: بۆ کەسی دووەمی کۆ

ب + گر + ن = بگرن

ب + هێن + ن = بهێنن

ئەگـەر ڕەگـی کـار کۆتـایی بـە پیتـی نـەبزوێن هـاتبوو وەکـو (خـوێن، نڤـیس) جێنـاوی (ە) دەردەکـەوێت و دەبێتـە بکـەری ڕسـتەکە. بەڵام ئەگەر ڕەگی کار کۆتایی بە پیتی بزوێنـی (ۆ – وو – ی – ێ – ە) هـاتبوو جێنـاوی (ە) بـۆ کەسـی دووەمـی تـاك بـەکار ناهێنرێـت واتـە

دەرناکەوێت چونکە دوو پیتی بزوێن بەدوای یەکتردا لە بڕگەیەکدا نایێن. وەکو کاری داخوازی (بڕۆ، بنوو، بلێ، بژی). جێناوی لکاو (ن) بۆ کەسی دووەمی کۆ هەمیشە دەردەکەوێت ڕەگی کار کۆتایی بە پیتی نەبزوێن یا بزوێن هاتبێت.

ئەگەر کاری داخوازی داڕێژراو یا لێکدراو بوو نیشانەی (ب) دروستە لە کاتی ئاخافتن یا نووسیندا دەرنەکەوێت، وەك:

(تێکۆشە، دانیشە، سەرکەوە) ئەمە بۆ کاری داخوازی داڕێژراو، هەروەها بۆ کاری داخوازی لێکدراو وەك:

(تێبکۆشە، دابنیشتە، سەربکەوە) (فڕێ بدە، تەواو بکە، یارمەتی بدە) دەگوترێت (فڕێی دە، تەواوکە، یارمەتی دە).

کاری داخوازی بە نیشانەی (ئامرازی) (مە، نە) دەکرێت بە نەرێ و شوێنی نیشانەی (ب) دەگرێتەوە، وەك: (بخۆ، ڕاببورن، یارمەتی بدە) دەبێتە (مەخۆ، رامەبوورن، یارمەتی مەدە).

ئەگەر کاری داخوازی سادە بوو نیشانەی (ب) دەچێتە سەرەتای کاری داخوازی، بەڵام ئەگەر داڕێژراو یا لێکدراو بوو دەچێتە پێش بەشە سەرەکییەکەی.

کاری داخوازی هەیە لەڕووی دروست کردنییەوە لەو دەستوورەی کە باسمان کرد لا دەدات، وەك:

(وەرە، بچۆ).

## دەستوور:

**کاری داخوازی: ئەو کارەیە کە ئاخێوەر (کەسی یەکەم) داوا لەو کەسەی کە بەرامبەریەتی (کەسی دووەم) تاک یا کۆ بێت دەکات بۆ ئەنجامدانی کارێک یەکسەر لەدوای ئاخافتن.**

**بەم شێوەیە پێك دێت:**

**{ ب + ڕەگی کار + جێناوی لکاو}**

**جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاك (ە) بۆ کەسی دووەمی کۆ (ن)**

## ڕاهێنان (١)

لەم نووسینەی خوارەوەدا کاری داخوازی دەربهێنەو چۆنیەتی دروستکردنی ڕوون بکەوە.

شاهینی گۆتە کوڕێ خۆ: ڕێزێ ل دایكو بابێن خۆ بگرە، ل دیوانان کێم باخڤە، گەلەکێ وەرگرەو کێمێ بدە، دەمێ برێڤە دچی ل سەرخۆ بە، چ ئاریشا بۆ کەسێ دروست نەکە، هەروەسا گۆتە کچێن خۆ: زوو بنڤن دا زوو ژ خەو ڕابن، ژ شیرەتێن دایکا خۆ دەر نەکەڤن.

## ڕاهێنان (٢)

لەم چاوگانەی خوارەوە کاری داخوازی دروست بکەو لەڕستەدا بەکاریان بهێنە:

(هەڵکێشان، یارمەتیدان، هەڵاتن، گۆتن، دامەزراندن، ئاڤاکرن).

## ڕاهێنان (٣)

لە ڕستەی (**پرۆژەکە بەخێرایی تەواو بکەن**)

١- کاری داخوازی دیار بخە، چۆن دروست کراوە؟

٢- بکەری ڕستەکە دیار بخە.

٣- وشەی پرۆژەکە شی بکەوە.

٤- لە کاری (تەواو بکەن) دەگونجێ نیشانەی (ب) لاببرێت؟ بۆچی؟

٥- کاری (تەواو بکەن) بکە بە نەهیو ڕستەکە سەر لەنوێ بنووسەوە.

٦- وشەی (بەخێرایی) چییە؟ ئەرکی چییە؟ چۆن دروست کراوە؟

## ڕاهێنان (٤)

پارچەیەك لەسەر (زستانێ بەفر لە کوردستان دەبارێت) بنووسەو ئەمجا هەر چ کاری داخوازی هەیە دەری بهێنە.

## ڕاهێنان (٥)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١. لە جەژنی نەورۆزدا جلی جوان لەبەر بکەن.

٢. نانەکەت بخۆو زوو بڕۆ بۆ قوتابخانە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| کێم باخڤە | : | کەم بدوێ، کەم قسە بکە. |
| بڕێڤە دەچی | : | بە ڕێگادا دەڕۆی. |
| ئاریشە | : | کێشە. |
| هەروەسا | : | هەروەها. |
| بنڤن | : | بنوون، بخەون. |
| ژ خەو ڕابن | : | لە خەو هەستن. |
| ژ شیرەتێن | : | لە ئامۆژگارییەکانی. |
| دەرنەکەڤن | : | دەرنەچن. |

# کاری بکەر دیارو بکەر نادیار لەشێوە زاری کرمانجی خوارووداا

ئـ/

١. ئازاد پەنجەرەکەی شکاند.

٢. کوڕەکان وانەکانیان نووسییەوە.

٣. جوتیارەکە زەوییەکە دەکێڵێت.

٤. تاڤگە نامەکانی دەخوێنێتەوە.

ب/

١. پەنجەرەکە شکێنرا.

٢. وانەکان نووسرانەوە.

٣. زەوییەکە دەکێڵرێت.

٤. نامەکان دەخوێنرێنەوە.

لەمەو پێش زانیمان کە کاری تێپەڕ، ئەو کارەیە کەبەهۆی وشەیەکی ترەوە واتای ڕستەکە تەواو دەکاتو دەبێتە بەرکاری کارەکە، ئەم ڕاستییە لە ڕستەکانی کۆمەڵەی (ا) دا بە تەواوی بەدی دەکرێت.

١. لە ڕستەی یەکەمدا (ئازاد) کە (بکەر)ە کارێکی کردووەو ئەرکی کارەکەی یەکسەر کەوتۆتە سەر (پەنجەرەکە)و بووە بە بەرکاری کاری (شکاند)و واتای ڕستەکەشی تەواو کردووە، بەڵام لەڕستەی یەکەمی بەشی دووەمدا یان لەبەر ئەوەی نەمانزانیوە کێ (پەنجەرەکەی

شکاند)ووه، یان نەمانویستووه ناوی (ئازاد) بێنین کە (بکەر)ی کارەکەیە، لەبەر ئەوە ڕستەکەمان لەشێوەی ڕستەی نادیار دەربڕیوه.

بۆ ئەم مەبەستەش، (بکەر)ی کارە ئاشکراکەو هەرچی وشەیەك کە پەیوەندی بە (بکەر)ەکەوە هەبێت لەناو ڕستەکەدا لای دەبەینو بەرکارەکە دەخەینە شوێنیو کارەکە دەخەینە شێوەی کارێکی نادیارەوە، بەو شێوەیەی کە لەسەرەوە نیشانمان داوە، بەم پێیە ڕستەکە دەبێتە (پەنجەرەکە شکێنرا)و (پەنجەرەکە) دەبێتە جێگری (بکەر)ەکە.

٢. لە ڕستەی دووەمدا هەمان ڕێگەمان گرتووە بۆ گۆڕینی کاری دیار بۆ کارێکی نادیار، بەڵام کە (بەرکار)ەکە دەچێتە شوێنی (بکەر) پێویستە بە پێی کەسو ژمارەی جێگری (بکەر)ەکە کارە نادیارەکەش بگۆڕێت، لەبەر ئەمە ڕستەکە دەبێتە (وانەکان نووسرانەوە).

٣. لە ڕستەکانی (سێیەمو چوارەم)دا کاری (دەکێڵێت)و (دەخوێنێتەوە) دوو کاری ڕانەبوردووی تێپەڕن، چونکە (بکەر)ەکانیان ئاشکران، بۆ گۆڕینی ئەم جۆرە کارانە، بە پێی ئەو دەستوورەی لە سەرەوە دەرمانخست، (بکەر)ەکان لەناو ڕستەکاندا لا دەبەینو (بەرکار)ەکانیان دەخەینە شوێنیانو کارەکانیش لەو شێوانەی کە لەڕستەکانی کۆمەڵەی (ب)دا نیشان دراون بەکار دەهێنین.

(نیشانەی – ڕێ – کەبۆ ڕانەبردووە جێناوی لکاوی (ێت) کە دەچێتە سەر (ڕێ) دەبێتە (رێت)

## دەستوور:

١. کاری دیار: ئەو کارەیە کە یەکسەر دەخرێتە پاڵ (بکەر)ەکەی و لە ناو ڕستەکەشدا باس دەکرێت.

٢. کاری نادیار: ئەو کارەیە کە (بکەر)ەکەی لەناو ڕستەدا باس ناکرێت و (بەرکار)ەکەی دەبێتە جێگری (بکەر)ەکەی.

٣. تەنیا کاری تێپەڕی دیار دەگۆڕێت بۆ کاری نادیار.

٤. لەم گۆڕینەدا پێویستە بە وردی سەرنجی (تاك و کۆ)ی جێگری (بکەر) بدەین و بەو پێیە ئاگاداری ژمارەو کەسی وکارە نادیارەکە بین.

٥. ئەگەر کارە تێپەڕەکە:

ئ- ڕابوردوو بوو، ڕەگی کار وەردەگرین و پاشگری (ڕا)ی دەخەینە سەر وەك:

| چاوگ | ڕەگ | کاری ڕابوردووی نادیار |
|---|---|---|
| خووساندن | خووسێن | خوسێن + را = خوسێنرا |
| کێلاَن | کێڵ | کێڵ + را = کێڵرا |
| شتن | شۆ | شۆ + را = شۆرا |
| نووسین | نووس | نووس + را = نووسرا |

ب- ڕانەبوردوو بوو، ڕەگی کار وەردەگرین و پاشگری (ڕێ)ی دەخەینە سەر[١]. وەك:

| چاوگ | ڕەگ | کاری رانەبردووی نادیار |
|---|---|---|
| نووسین | نووس | دە+ نووس + ڕێ = دەنووسرێ |
| خوێندن | خوێن | دە + خوێن + ڕێ = دەخوێنرێ |

(١) لەدوای (ڕێ) جێناوی لکاو دێت و دەبێ بە پێی کەس و ژمارەی جێگری بکەر دابنرێ.

**تێبینی:**

**هەندێ کار کە دەکرێن بە بکەر نادیار لە دەستوور لادەدەن، چونکە بە ڕەگی کار ناکرێن بە بکەر نادیار بەڵکو بە قەدی چاوگ دەکرێن واتە:**

**قەد + را = وەکو:**

**گوتن: گوت + را = گوترا، گوت + رێ = دەگوترێ**

**ویستن: ویست+ را = ویسترا، ویست+ رێ = دەویسترێ**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستانە لە بکەر دیارەوە بگۆڕە بۆ بکەر نادیار:

١. منداڵەکە هێلکەیەکی خوارد.

٢. قارەمانێك فڕۆکەیەکی دوژمنی خستە خوارەوە.

٣. ئەندازیارەکان خانووەکان دروست دەکەن.

٤. ئەوان چوار جار وانەکە دەنووسنەوە.

٥. ئەو هەموو ڕۆژێ سێ جار دەمو چاوی دەشوات.

٦. ئاراس کراسەکەی دارای دڕاند.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم کارانە لە بکەر نادیارەوە بگۆڕە بۆ بکەر دیار:

١. دوو چاڵ هەڵکەنرا.

٢. گەنم دەهاڕێت‌و دەکرێت بە هەویرو لە دواییدا دەشێلرێت‌و دەکرێت بە نان.

٣. دوێنێ دیوارەکان‌و سەربانەکان سواخ دران.

٤. شەش مانگە باخەکە ئاو دەدرێت.

٥. هەموو وانەیەك پێش هاتنە ژوورەوەی مامۆستا تەختە ڕەشەکە دەسڕێتەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم کارە نادیارانە لەڕستەدا بەکاربهێنە:

خورا، شکێنرا، دەگیررێت، دەبینرێت، دەخوێنرێت، پێشکەش دەکرێت، هەڵدرا.

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم بۆشاییانە بە کارێکی بکەر نادیار پڕ بکەرەوە:

١. پێش نانخواردن دەست...........

٢. لە کتێبخانە گشتییەکاندا ڕۆژی سەدان کتێب ...........

٣. سبەینێ منداڵەکان ........... ەوە بۆ گوندەکەی خۆیان.

٤. پێویستە میوە ........... ەوە ئەمجا ...........

٥. کەی دەرگای فەرمانگە ...........

## ڕاهێنانی (٥)

### شیکردنەوە:

١. دیواری باخەکە ڕووخێنرا.

**دیوار** : ناوە، تاکە، نەناسراوە، جێگری بکەرە.

**ی** : ئامرازی خستنە سەرە.

**باخەکە:** ناوە، تاکە، ناسراوە، دیارخەری ناوی (دیوار)ە.

**دیواری باخەکە:** گرێی ناوییە، جێگری بکەرە.

**ڕووخێنرا:** کاری ڕابوردووی بکەر نادیاری نزیکە.

٢. ئەم ڕستانەش شی بکەرەوە:

ئـ – دزەکە لەژوورەکەدا گیرابوو.

ب– پاقلەکە لە مەنجڵەکەدا کوڵێنراوە.

پ – گەنم چۆن دەچێنرێت؟

**سەرچاوە:** پەرتووکی زمانو ئەدەبی کوردی/ پۆلی سێیەم– سلێمانی

# کاری بکەر دیارو بکەر نادیار
# لەشێوەزاری کرمانجی ژووروودا

**(أ)**

١. شڤانی پەز چەراند.
٢. ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ ئاڤدایە.
٣. وێ نان دخوار.
٤. وی کەوەك گرتبوو.
٥. پەری چیرۆکێ دنڤیسیت.
٦. ئەز نامەکێ دێ نڤیسم.

**(ب)**

١. پەز هاتە چەراندن.
٢. ڕەز هاتییە ئاڤدان.
٣. نان دهاتە خوارن.
٤. کەوەك هاتبوو گرتن.
٥. چیرۆك دهێتە نڤیسین.
٦. نامەك دێ هێتە نڤیسین.

کاتێك سەیری ڕستەکانی بەشی (أ) دەکەین، دەبینین پەیڤەکانی (چەراند، ئاڤدایە، دخوار، گرتبوو، دنڤیسیت، دێ نڤیسم) هەموویان کاری تێپەڕن، چونکە کاریگەری کارەکانیش کەوتۆتە سەر ناوێکی تر کە (بەرکار)ەو، هەر یەکەیان کردەوەیەکیان پیشان داوەو خراونەتە پاڵ بکەرەکانیانو هەموویان بەسەر یەکەوە ڕستەیەکی بکەر دیاریان پێکهێناوە.

بەڵام کاتێك سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) دەکەین، دەبینین پەیڤەکانی (هاتە چەراندن، هاتییە ئاڤدان، دهاتە خوارن، هاتبوو گرتن، دهێتە نڤیسین، دێ هێتە نڤیسین) هەموویان کاری بکەر نادیارن، چونکە هەر یەکەیان کردەوەیەکی پیشان داوەو نەخراونەتە پاڵ کەسێکی دیارو ئاشکرا (واتە نازانرێ کێ کارەکەی ئەنجام داوە)، لەبەر ئەوە بەم جۆرە کارانە دەگوترێت کاری بکەر نادیار.

کەواتە لەدوای خوێندنەوەو تێڕامانمان لە شێوەزاری کرمانجی ژووروو ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە یاسای گۆڕینی کاری بکەر دیار بۆ کاری بکەر نادیار جیاوازە لە شێوەزاری کرمانجی خواروو، چونکە لە کرمانجی ژووروودا کاری ڕستەکە دەگەڕێتەوە بۆ (چاوگ)و پاشان کاری یاریدەری (هات)یش بە پێی جۆری کاتی کارەکە بەکار دەهێنین.

## کاری ڕابوردوو:

١. کاری ڕابوردووی نزیك:

ئەم جۆرە کارە بە پێی ئەم یاسایە ئەنجام دەدرێت:

هاتە + چاوگ

هاتە + چاندن ← هاتە چاندن

هاتە + کڕین ← هاتە کڕین

٢. کاری ڕابوردووی تەواو:

ئەم جۆرە کارەش بەپێی ئەم یاسایە ئەنجام دەدرێت:

هاتییە + چاوگ

هاتییە+ کوشتن ← هاتییە کوشتن

هاتییە + لێنان ← هاتییە لێنان

٣. کاری ڕابوردووی بەردەوام:

دهاتە + چاوگ

دهاتە + ئینان ← دهاتە ئینان

دهاتە + ڕێشتن ← دهاتە ڕێشتن

٤. کاری ڕابوردووی دوور:

هاتبوو+ چاوگ

هاتبوو + خوارن ← هاتبوو خوارن

هاتبوو + خواندن ← هاتبوو خواندن (خاندن)

## کاری ڕانەبوردوو:

لەشێوەزاری کرمانجی ژووروودا کاری ڕانەبوردوو بۆ دەمی ئێستا (نهۆ)و ئایندە (پاشی) بە ئاشکرا دەردەکەوێت لە کاتی ئاخاوتندا، لەبەر ئەوە پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت لەکاتی گۆڕینی کاری بکەر دیار بۆ کاری بکەر نادیار:

١. کاری ڕانەبوردوو بۆ دەمی ئێستا (نهۆ):

کاری یاریدەی (دهێتە) بەکاردێت لە پێش چاوگەکەدا:

دهێتە + چاوگ

دهێتە + کڕین ← دهێتە کڕین

دهێتە + کوشتن ← دهێتە کوشتن

٢. کاری ڕانەبوردوو بۆ دەمی ئایندە (پاشی):

کاری یاریدەی (دێ هێتە) لە پێش چاوگەکەدا بەکاردێت:

دێ هێتە + چاوگ

دێ هێتە + فرۆتن ← دێ هێتە فرۆتن

دێ هێتە + ماڤێتن ← دێ هێتە ماڤێتن

## دەستوور:

١. **کاری بکەر دیار: ئەو کارەیە کە کردەوەو ڕەفتارێك لەکاتێکی دیاریکراو (ڕابوردوو یان ڕانەبوردوو) دا پیشان داوە یان پیشان دەداتو ئەو کارەش کە دراوەتە پاڵ بکەرەکەی، دیارو ئاشکرایە لە ڕستەکەدا.**

٢. **کاری بکەر نادیار: ئەو کارەیە کە کردەوەو ڕەفتارێك لە کاتێکی دیاریکراو (ڕابوردوو یان ڕانەبوردوو)دا پیشان داوە یان پیشان دەداتو ئەو کارەش نەدراوەتە پاڵ بکەرەکەیو دیارو ئاشکرا نییە لە ڕستەکەدا.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا کاری بکەر دیار بگۆڕە بۆ کاری بکەر نادیار لە شێوەزاری کرمانجی ژووروودا:

١. پێشمەرگە لەشکری دوژمنی دەشکاند.

٢. سەرداری وانە نڤیسی.

٣. کوڕەکە گوریسەکەی توند بەستبوو.

٤. ویٚ هەڤیر کربوو.

٥. خۆزی خوێندکاران وانەیان بە چاکی بخوێندایە.

٦. نەسرین دیٚ شیڤیٚ لێنێت.

٧. من کتێب ژ وی وەرگرتییە.

٨. بارام نانی دخوت.

٩. مامۆستایان بە دڵسۆزییەوە ئەرکی سەرشانیان جێبەجیٚ دەکەن.

## ڕاهێنانی (٢)

(خوێندکاران بە پێنووسەکانیان وڵات پێش دەخەن).

لەم ڕستەیەدا:

١. (خوێندکاران) چییە؟ ئەرکی چییە؟

٢. (یان) چییە؟ بە چاکی شیی بکەرەوە.

٣. کاری ڕستەکە دەربهێنەو پاشان شی بکەرەوە.

٤. ڕستەکە لە کاری بکەر دیارەوە بگۆڕە بۆ کاری بکەر نادیار.

٥. لە کاری ڕستەکە هەموو تافەکانی ڕابوردووی بکەر نادیار دروست بکە.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەرەوە:

١. پەز دێ هێتە دۆشین.

٢. گۆڤارەکانمان بە چاکی دابەش کردووە.

٣. دزەکە گیرابوو.

## جێناوی پرس

**ئەم نووسینە بخوێنەوە:**

جارێکیـان لەگـەڵ کۆمـەڵێك پـسپۆڕو شـارەزا لـە بـواری چـاندن‌و کشتوکاڵدا چووین بـۆ گونـدێن دەوروبـەرێ هـەولێرێ، لـەوێ چاومان بـە کۆمـەڵێك جوتیـار کـەوت، پـاش بـەخێر هێنـان‌و حەسـانەوە، یـەك لـە شارەزایان هەندێك پرسیاری لە سەرۆکی کۆمەڵەی جوتیارانی گوند کـرد، پرسی: تۆ چیت‌و ناوت چییە؟ لـەم جوتیارانـە کامیـان ئەمـساڵ گـەنمی ڕەشـگوڵی چـاندووە؟ سـەرۆکی کۆمەڵـە بەرسـڤاوی داو گـۆت: ئـەز جوتیـارم‌و نـاڤێ مـن بـاپیرە. ئەمـساڵ مـام بـایز ئـەم جـۆرە گەنمـەی چاندووە، لە پاشان پرسیاری لێ کردوو گوتی:

کێ تا ئێستاش زەوی خۆی بـە گاسـن دەکێلێت؟ دیسا سـەرۆکی کۆمەڵـە بەرسـڤ داو گۆت: مـام حەمـەدو مـام بـاپیر تـا نهۆژی هـەر ب گاسنی زەڤیێن خۆ دکێلن، چونکو دەستێ وان کورتـەو ئـەو نـەدارن. ژ بەر هندێ شارەزای فەرمان دا کو ئەڤ ساڵە ژ لایـێ وەزارەتـا کشتوکاڵ‌و چاندنێ ڤە، تراکتەرەك بۆ وان بێتە کڕین داکو زەڤیێن خۆ پێ بکێلن.

دیسان چەند پرسیارێکی دی ئاراستە کردو گوتی: بەرهەمەکانتان بـە چی دەگوازنەوە بۆ شار؟ لەم جوتیارانە کیهەیان بەرهەمی لـە هـەموویان پـترە؟ کیـژان زەڤیـێن بـەراڤ هەنـە؟ درەختـی چـی لـە زەوییـەکانیان دەچـێنن؟ لـە وەڵامـدا سـەرۆکی جوتیـاران گـوتی: هەنـدێکمان بەرهەمەکانمان بە تراکتەرو هەندێکیشمان بە وڵاخ دەگوازینەوە بۆ شـار، لەم جوتیارانەش خاڵە بایز بەرهەمی لە هەموویان پـترە. هـەر خـاڵ بـایز

خۆی زەوی بەراوی هەیە، جوتیاران داری میوەو درەختی ئەسپینداروو چنار لە زەوییەکانیان دەچێنن.

پشتی ڤێ سەرەدانیێ، شارەزاو پسپۆرێن بوارا چاندنو کشتوکالێ خاترا خۆ خواستو زڤرێنە ڤە جهێ خۆ.

## خستنە ڕوو:

لە بەرنامەی سالآنی پێشوودا، زانیمان کە ڕستەی ڕاگەیاندن بە دوو شێواز دەکرێ بە ڕستەی پرس:

ئـ - یان بەهۆی جۆری دەربڕینو ئاوازی تایبەتی پرسەوە.

ب - یان ژی ب بکار هینانا پەیڤەکا پرسێ، ئەو پەیڤ ژی یان دبیتە (جێناو) یان (هاوەڵناو) یان (هاوەڵکار)ێ پرسێ.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دەقی نووسینەکە، دەبینین لە گەلەك شوێناندا ڕستەکان لە شێوەی پرس دان، بۆ ئەم مەبەستەش پەیڤێکی پرس بەکار هاتووە، بەم جۆرە:

١. لەڕستەی (لەم جوتیارانە کامیان ئەمسالێ گەنمی ڕەشگوڵی چاندووە؟)دا، دەبینین ڕستەکە بەهۆی پەیڤی (کامیان)ەوە کراوە بە ڕستەی پرس، پەیڤەکەش لە شوێنی ناوی ئەو جوتیارە بەکارهاتووە کە ئەو جۆرە گەنمەی چاندیە، بەکارهێنانەکەش لەشێوەی پرس دایە، کە پرسەکەش وەلآم دەدرێتەوە پێویستە ناوی ئەو جوتیارە باس بکرێ کە پرسەکەی لە بارەیەوە کراوە، هەر لەبەر هەندێ پەیڤەکە بە (جێناوی پرس) دادەنرێت.

٢. له ڕستەی (کێ تا ئێستاش زەویێ خۆی بەگاسن دەکێلێت؟)دا، ڕستەکە بەهۆی پەیڤی (کێ) کراوە بە ڕستەی پرسو ئەم پەیڤەش لە شێوەی پرسدا لە شوێنی ناوی ئەو کەسە هاتیە بکار هینان کو زەویێ خۆ ب گاسنی دکێلیت، هەر ژبەر هندێ ئەو ژی دبیتە (جێناوی پرس)و هەروەسا دبیتە (بکەر)ێ ڕستەی.

٣. هەروەها لە ڕستەی پرسی: تۆ چیتو ناوت چییە؟ دا، ڕستەکە بەهۆی پەیڤی (چی) دووجار کراوە بە ڕستەی پرس، کە دیارە جارێکیان لە کارو پیشەی کابراو جارێکیش لە ناوەکەی دەپرسێت. لە هەردوو باریشدا وەڵامەکەی بەناوێك دەدرێتەوە، واتە پەیڤی (چی) لە شوێنی ناوەکە بەکاردێت، بۆیە دەبێتە (جێناوی پرس).

بێجگە لەو ڕستانەی کە باس کران، نووسینەکە گەلێك ڕستەی تری تێدایە کە لەشێوەی پرس دانو پەیڤەکانی وەك (جێناوی پرس) بەکارهاتوون.

**دەستوور:**

**جێناوی پرس، ئەو پەیڤانەن کە:**

**ئـ - لەجێی ناوی کەسێك یان شتێك لەشێوەی پرس کرندا بەکاردێنو ئەرکی ناوە لێپرسراوەکەش لە ڕستەکەدا دەبینین، ئەرکەکانیش ئەڤەنە:**

### جێناوی پرس دەبێتە:

١. بکەری ڕستە، وەك: کێ شاری سولەیمانی دروستکرد؟
٢. بەرکاری ڕستە، وەك: دوێنێ کێت دیت؟
٣. تەواوکەری بە یاریدە، وەك: تە ئەڤ پەرتووکە ژکێ وەرگرت؟
٤. دیارخەری ناو، وەك: کوڕێ کێ لە پێناوی کوردستاندا هاتە شەهیدکرن؟
٥. تەواوکەری کاری بێ هێز، وەك: شیرین کچی کێیە؟
٦. نیهادی ڕستە، وەك: کێ زیرەکە؟
٧. جێگری بکەرە، وەك: کێ بینرا؟

ب. ئەو پەیڤێن کو دبنە جێناوی پرس ئەڤەنە:

١. کێ – کی: لەجێی ناوی کەسێك لەشێوەی پرسدا بەکاردێت.
٢. کام – کامە- کیهە- کیهان- کیشك – کیژان: هەموویان یەك واتایان هەیە، بۆ جوداکردنەوەی کەسێك یان شتێك لەناو کۆمەڵە کەسێك یان شتێك بەکاردێن.

پ. چ – چی: لەجێی ناوی شتێك بەکاردێ، لەشێوەی پرس، وەك: کتێبی چی دەخوێنییەوە؟

## ڕاهێنانی (١)

ئەرکی جێناوی پرس لەم ڕستانەدا دەست نیشان بکە:

١. قوتابیان، کێیان لەناو باخچەدا دیت؟

٢. کێ نەخۆش کەوت؟

٣. چ کەوتە خوارەوە؟

٤. ڕەخنەکەتان لەبارەی چییە؟

٥. کیهەیان لە پێشبرکێدا بە یەکەم دەرچوو؟

٦. تە ئەڤ پەڕتووکە ژکێ وەرگرتو تە دایەکێ؟

٧. ئێوە حەز لە گۆشتی چی دەکەن؟

٨. کیژان دشێت بسەر ڤی داری بکەڤیت؟

## ڕاهێنانی (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١- پەیڤی پرس کەنگی دەبێتە جێناوی پرس؟

٢- جیاوازی لەنێوان جێناوی کەسی سەربەخۆو جێناوی پرسدا چییە؟ (وەڵامەکەت بە نموونەی ڕستەیی بسەلمێنە).

٣- ئایا جێناوی پرس، جێناوی لکاو وەردەگرێت؟ بۆ سەلماندنی وەڵامەکەت دوو ڕستە بهێنەوە، کە هەر یەکەیان جێناوێکی پرسی تێدا بێت.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

١- کامە بە یەکەم دەرچوو؟

٢- دوێنێ کێت بینی؟

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | |
|---|---|
| حەسانەوە | : پێهنڤەدان |
| ناوت | : ناڤێ تە |
| کامیان | : کی ژوان |
| وەڵام | : بەرسڤ |
| ئەو | : وی |
| ئێستاش | : نهۆژی |
| لەبەر ئەوە | : ژبەر هندێ |
| دەتوانێت | : دشێت |
| پێشبرکێ | : هەڤبڕکێ |
| وەڵامی ئەوی دایەوە | : بەرسڤاویدا |
| بکرێت | : بێتە کرین |
| دەگوازنەوە | : ڤەدگوهێزن |
| شار | : بازێر |
| وڵاخ | : دەوار |
| هەژارن، کەم دەرامەتن | : نەدارن |
| گەڕانەوە | : زڤرینەڤە |

# هاوەڵناوی پرس

ئەم ڕستەو دێڕە هۆنراوانە بخوێنەوە:

١. چەند جۆرە پێنووست کڕی؟

ته چەند (چقاس) پارە هەیە؟

٢. کام ئەستێرەی گەش، کام گوڵی کێوی؟

ئاڵە وەك کوڵمی، گۆی مەمکی، لێوی.

٣. کیژان ژن ژهەمیا درێژ ترە؟

٤. جەژنی نەورۆزی ئەمساڵ کوو بوو؟

چۆن دیارییەکت بۆ براکەت نارد؟

دیارییەکی چۆنت بۆ نەوزادی برات نارد؟

ته دیارییەکا چاوا بۆ نەوزادێ برایێ خۆ هنارد؟

٥. چ قوتابی یێك لە تاقیکردنەوە لە هەموو وانەکان دەردەچێت؟

٦. پۆلی چەندەمی؟

ئازاد چەندەمین قوتابییە کە لەڕێزماندا دەرچووە؟

## خستنە ڕوو:

ئەگەر بە هوردی تەماشای ڕستەکانی سەرەوە بکەین، دەبینین لە کۆتایی هەر ڕستەیەکدا نیشانێکی پرس (؟) هەیە، بەمەش بۆمان دەردەکەوێت کە ڕستەکە لەشێوەی پرس دایە. جا ئەگەر زیاتر لە ڕستەکان ڕامێنین دەبینین پەیڤەکا پرسێ لە هەر یەك لەو ڕستانەدا هەیە، کە بەهۆی ئەو پەیڤەوە مە پرس کردیە.

١. لەڕستەکانی ژمارە (١) دا، پەیڤێ پرسی (چەند) بە کارهاتووە، کە لەگەڵ ناوێکدا، بە کارهاتووەو پرسی پێ لەو ناوە دەکرێت، دیارە لە وەلامیشدا دەبێ پەیڤەکی وا بەکاربێت کە وەسفی ناوەکە بکاتو ببێتە تەواوکەر بۆی. وەك ئەوەی لە وەلامی پرسیاری یەکەمدا بلێین (دوو جۆرە پێنووسم کڕی) کە دیارە لێرەدا هاوەڵناوی (دوو) وەلامی پەیڤی پرسی (چەند)ە، کەواتە پەیڤەکە هاوەڵناوی پرسە. ڕستەی دووەمیش هەر ب ڤی ئاوایە.

٢. لەو دێڕە هۆنراوەی (گۆران)دا دوو جار پەیڤی (کام) بەکارهاتووە، جارێکیان لە پێش ناوی (ئەستێرە)و جارا دووەم ژی لەپێش ناوی گوڵ، کە دیارە لە هەردوو باردا لە دەست نیشان کردنی ناوەکانی (ئەستێرەو گوڵ) دەپرسێت، بۆیە ئەگەر وەلامی پرسیارەکە بدەینەوە دەبێ بلێین ئەم ئەستێرەیە، یا، ئەم گوڵە، ئاڵە وەك کوڵمی، وەك گۆی مەمکی، وەك لێوی دیارە وەلامەکە بە (ئەم...ە) دراوەتەوە، کو ئەو ژی هاوەڵناوێ نیشانییە، هەر بۆیە پەیڤی (کام) وەکو هاوەڵناوی پرس بەکارهاتیە.

٣. هەر بڤی ئاوای، پەیڤا پرسێ (کیژان= کی ژوان) دگەل (ژن) یا هاتیە ب کار ئینانێ، داکو لناڤ کۆمەڵەکا ژنان، وێ ژنێ دەست نیشان بکەت، کو ژ هەمی ژنێن دی درێژترە، هەر ژبەر هندێیە ئەڤ پەیڤە ژی ب هاوەڵناوێ پرس دهێتە ناسین.

٤. لە ڕستەکانی ژمارە (٤)دا، پەیڤەکانی (کوو، چۆن، چاوان) لە واتادا یەکن و لەگەڵ ناودا بەکارهاتوون، لەناو ئەوانەشدا پەیڤی (چۆن) لە دوو شێوەدا بەکارهاتووە بەم جۆرە:

ئـ – لە پێش ناودا هاتووە، کە لەو بارەدا پێویستی بە (ی) ئامرازی دانە پاڵ نییە.

ب– لە دوای ناودا، کە پێویستی بە ئامرازی (ی، أ، ێ) هەیە بۆ دانە پاڵ، ئەگەر وەڵامی پرسەکانیش بدەینەوە، دەبێ لە وەڵامەکاندا وەسفی ناوەکان بکەین، بۆیە پەیڤەکانی (کوو، چۆن، چاوان) بە هاوەڵناوی پرس دێنە هەژماردن.

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا بەهۆی پەیڤی پرسی چـ ... ێك، پرسیارمان لەو قوتابییە کردووە کە لەهەموو وانەکان دەردەچێت، مەبەستیش ناوی قوتابییەکە نییە، بەڵکو سیفەتەکەیەتی، بۆیە لە وەڵامدا دەڵێین: (قوتابی زیرەك، یان قوتابی هشیار... هتد) لە هەموو وانەکان دەردەچێت، کەواتە یەپڤی پرسی ناوبراو، لەشێوەی هاوەڵناوی پرس بەرکار هاتووە.

٦. لە هەر دوو ڕستەی ژمارە (٦)دا پەیڤی پرسمان لە شێوەی (چەندەم، چەندەمین) بەکارهێناوە، کە پرسی پێ لەڕیز بەندی دەکەین، لە وەڵامیاندا ژمارەیەك لەشێوەی هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێکخستندا بەکاردەهێنین، بۆیە ئەو ژی دبنە هاوەڵناوا ڤێ پرسێ.

## دەستوور:

١ - هاوەڵناوی پرس، پەیڤەکا پرسێیە کو هەردەم دگەل ناوەکیدا بەکاردێتو وەسفی ناوەکەی پێ دەکرێتو دەبێتە تەواوکەری لە شێوەی پرسدا.

٢ - هاوەڵناوی پرس بە زۆری ئەگەر لە پێش ناوەکەوە هات پێویستی بە ئامرازی دانە پاڵ (خستنەسەر) نابێت وەکو:

کام سوار گەهشتە جێ؟

کیش هەسپ ژ هەمیا خێراترە؟

چەند هەڤاڵت هەن؟

چ ئەسپێك ڕەسەنە؟

بەڵام جاری وا دەبێ لە پاش ناوەکەوە دێت، ئەو کاتە ئامرازی دانە پاڵی دەوێت وەك:

هوین ل گوڤەندەکا چاوان پشکدار بوون؟ (أ) ئامرازی دانە پاڵە (خستنەسەرە).

ئەوان لە ڕۆژێکی چۆن سەفەریان کرد؟ (ی) ئامرازی دانە پاڵە (خستنە سەرە).

٣ - ئەو پەیڤێن پرسێین کو دبنە هاوەڵناوی پرس ئەڤەنە:

ئ- کام، کامە، کیهان، کیهە، کیژان، کیش.

ب- چەند (چقاس).

پ- چۆن، چاوا، کوو، چلۆن.

ت- چ ... ێك (یٚ- ەك).

## ڕاهێنانی (١)

پەیڤی (چۆن) لەدوو ڕستەدا بەکاربێنە، بەو مەرجەی لەیەکەمیاندا تەواوکەری کارێکی ناتەواو، لە دووەمیاندا وەسفی ناوێك بکات.

## ڕاهێنانی (٢)

وەلامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. کەی پەیڤی پرس دەبێتە هاوەلناوی پرس؟

٢. لە چ بارێکدا ئامرازی دانە پالْ لەگەلْ پرسراوەکە بەکاردێت؟

٣. پەیڤی (کام) لە دوو ڕستەدا بەکاربێنە، بە مەرجێك لە یەکەمیان جێناوی پرسو لە دووەمیاندا هاوەلناوی پرس بێت.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە (شی بکەوە):

١.چەند ڕۆژنامە ل کوردستانێ دەردکەڤن؟

٢.کیهان کچ خوشکا تەیە؟

٣.بەرانێکی چۆنت کڕی؟

# هاوەڵکاری پرس

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

/١

ئـ- قوتابیان لە ڕۆژی نمایشی وەرزشیدا چۆن دەڕۆیشتن؟

ب- ئەڤ کوڕە چاوا دنقیسیت؟

پ- منداڵەکان کوو دانیشتبوون؟

/٢

ئـ- کابرای دوێنێ لاتان بوو، چەند پێکەنی؟

ب-پەروین لنك تە چەند ڕوونیشت؟

/٣

ئـ- کەی ماست و کەنگر پەیدا دەبن؟

ب- کەنگی ئەم دێ چینە زۆزانان؟

پ- کەینێ زەنگی یەکەم وانە لێ دەدرێت؟

/٤

ئـ- هاوینان لە کوێ دەنوون؟

ب- لەزگین لکیڤە ڕوونیشتبوو؟

/٥

ئـ- بۆچی مەڕەکەی تۆ لاواز بووە؟

ب- ژ بەرچی زەڤیا تەیا تێهنیە؟

## خستنە ڕوو:

لە وانەکانی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە هەندێك لە پەیڤەکانی پرس دەبنە جێناوی پرس‌و هاوەڵناوی پرس. بۆیێ پێویستە ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە هەندێك جار پەیڤەکانی پرس بۆیان هەیە ببنە هاوەڵکاری پرسیش، بۆ نموونە:

١. ئەگەر تەماشای ڕستەکانی (ئ، ب، ج)ی ژمارە (١) بکەین دەبینین پەیڤەکانی پرسی (چۆن، چاوا، کوو) بەکارهاتوون‌و هەر سێکیان پرسیاریان پێ لە چۆنیەتی ڕوودانی کاری ڕستەکان دەکرێت، بۆ نموونە لەڕستەی (ئ)دا پەیڤی (چۆن) پرسیاری پێ لە چۆنیەتی ڕۆیشتنی قوتابیان کراوە، بۆیێ کە وەڵامی پرسەکە دەدەینەوە، پێویستە هاوەڵکارێك بەکاربێنین کە بگونجێت لەگەڵ چۆنیەتی ڕۆیشتنەکە، واتە بڵێین (باش دەڕۆیشتن) یا (خراپ دەڕۆیشتن) کە لێرەدا هەردوو پەیڤی (باش‌و خراپ) هاوەڵکاری چۆنیەتین، چونکە وەسفی چۆنیەتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەکەن‌و سنوورێك بۆ ڕوودانی کارەکە دادەنێن، ئەم دوو پەیڤەش لە وەڵامی پەیڤی پرسی (چۆن) بەکارهاتن، کەواتە لێرەدا (چۆن) دەبێتە هاوەڵکاری پرس، هەر بەو جۆرەش پەیڤەکانی (چاوا (ن) کوو) ئەو ژی هەر دبنە هاوەڵکاری پرس.

٢. دیسا ژی لە هەردوو ڕستەی (ئ، ب)ی ژمارە (٢)دا، پەیڤی پرسی (چەند) لە دوو ڕستەدا لەشێوەی پرس بەکارهاتووە، بۆ پرسین لە

ڕادەی ڕوودانی هەردوو کاری (پێکەنیو ڕونیشت)، لە وەڵامیشدا پێویستە هاوەڵکارێکی گونجاو بەکاربهێنین، وەك ئەوەی بڵێین (کابرا دوێنێ زۆر پێکەنی)، یان (پەروین ژنك من پیچەك ڕوونیشت)، کە هەردوو پەیڤی (زۆر، پیچەك) هاوەڵکاری چەندینو لە وەڵامی پەیڤی پرسی (چەند) بەکارهاتوونو وەسفی ڕادەی ڕوودانی کارەکە دەکەن، بۆیێ دەبنە هاوەڵکاری چەندیو پەیڤی (چەند)یش دەبێتە هاوەڵکاری پرس.

٣. ئەم جارەش لەڕستەکانی (أ، ب، جـ)ی ژمارە (٣)دا، پەیڤەکانی پرسی (کەی، گەنگی، کەینێ) بۆ پرسیارکردن لەکاتی ڕوودانی کاری ڕستەکان بەکارهاتوونو لە وەڵامدا پێویستە هاوەڵکارێکی کات بەکاربهێنین، وەك ئەوەی لە وەڵامی پرسیاری (ب)دا بڵێین (ئەم هاڤینێ دێ چینە زۆزانان)، کە دیارە پەیڤی (هاڤین= هاوین) هاوەڵکاری کاتەو وەڵامی پەیڤی پرسی (کەنگی) پێ دراوەتەوە، بۆیێ ئەو پەیڤە پرسانەش دەبنە هاوەڵکاری پرس.

٤. هەر بەو جۆرەش لە ڕستەکانی (أ، ب)ی ژمارە (٤)دا هەر دوو پەیڤی پرسی (لە کوێ، لکیڤە) بۆ پرسیارکردن، لەجێو شوێنی ڕوودانی کارەکە دەپرسن، بۆیێ ئەو ژی دبنە هاوەڵکارێ پرس.

٥. هەر لە ڕستەکانی (أ، ب) ی ژمارە (ە)دا، پەیڤەکانی (بۆچی، ژ بەرچی) بۆ پرسیارکردن لە هۆکاری ڕوودانی کارەکە بەکارهاتوون، بۆیێ ئەوانیش دەبنە هاوەڵکاری پرس.

**دەستوور:**

**١. هاوەڵکاری پرس: پەیڤێکە لە شێوەی پرسدا، وەسفی کارێك دەکاو سنوورێك بۆ ڕوودانی کارەکە دادەنێت و دەبێتە تەواوکەریشی.**

**٢. ئەو پەیڤێن پرسیٚ کو دبنە هاوەڵکاری پرس ئەڤەنە؟**

**ئ- (چەند) کە لە ئەندازەی ڕوودانی کارەکە دەپرسێت.**

**ب- (چۆن، چاوا، کوو): لە چۆنیەتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەپرسن.**

**پ- (کەی، کەنگی، کەینیٚ): لەکاتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەپرسن.**

**ت- (لە کویٚ، لکیڤە): لە شوێن و جێی ڕوودانی کارەکە دەپرسن.**

**ج- (بۆچی، ژبەرچی، لەبەر چی): لە هۆکاری ڕوودانی کاری ڕستەکە دەپرسن.**

## ڕاهێنانی (١)

پەیڤی (چۆن) لەدوو ڕستەدا بەکاربێنە، بەو مەرجەی لەڕستەی یەکەمیاندا هاوەڵناوی پرس و لە دووەمیاندا هاوەڵکاری پرس بێت.

## ڕاهێنانی (٢)

وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە:

١. جیاوازی لەنێوان هاوەڵناوی پرس و هاوەڵکاری پرس و جێناوی پرسدا چییە؟

٢. دوو ڕستە بە دوو هاوەڵناوی پرس بهێنەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم هۆنراوانە بخوێنەوەو، هەر پەیڤێکی پرس کە لەواندا هەیە، دەست نیشانی بکەو جۆرەکەشی پیشان بدە:

١. کێ دەزانی؟ چلۆن بەیـــــان دادێ؟
لەمنی شێتو شاعیری دڵتــــــەڕ
کێ دەزانێ خەیاڵی بن لێفــــــەم؟
چۆن بەسەر کەوشەنا دەکا شەو پەڕ؟ (هێمن)

٢. کانی کەو؟ بۆچی ناخوینن؟ کانێ وارێ گولگولی؟
لێ دچەرینن گورگو ڕیڤی، بۆ شەلێ مارو کولی. (ب. س)

٣. کەی ساوای ئێمە بزەی لە لێـــــوە؟
هەر چاوی گەشە فرمێسکی پێـــوە
کام ماڵ سوتاوی کوردی ئاوارە؟
پێی نەگوتراوە، مەڵێ هـــاوارە (عەونی)

٤. ڕاستم پێ بێژە کێت دیوە بە چاو؟
چیت دیوە لە ڕووی گێتی، ناتەواو؟ (قانع)

٥. بەڵێ (بێکەس) نابووت بـــــوو،
جار جار، برسی بوو، ڕووت بوو،
بەڵام کام تێر، کام پۆشـــــــتە
وێنەی ئەو، ئەی فریشتـــــــە
بێ باك وەستا بەرامبـــــــەر
نووکی سونگی ستەمـــــــگەر

**کێ وا لەژێر زنجیرا؟**

**ئازادی هات بەبیرا؟** (گۆران)

**٦ - با خچەیێ ڤینا نەمایی کێ وەکر کافل بیـــــــت**

**تۆرینا بەختێ مە ئەڤرۆ کێ وەکر زیزو سل ببت؟** (ب.س)

## ڕاهێنانی (٤)

پەیڤە هێل بەژێر داهاتووەکان لـەم ڕستـەو دێـڕە هۆنراوانـەدا شـلۆڤە بکە:

١. گرفتاری شەوی ئەگریجەتم، کوا ڕۆژی رووت قوربان؟

مەتۆرێنە دڵم توخوا، تەماشا چەند پەرێشانە؟

(قانع)

٢. تە کی ل خاندنگە هێ دیت؟

٣. وێ ئەڤ هۆزانە چاوا ژ بەر کرییە؟

٤. تۆ چیت؟ من کوردم نەتەوەی کوردم

خۆ ترسنۆك نیت؟ حاشا نەبەردم

چی تۆی لەناو برد؟ دوو دڵیو نیفاق

چۆن ڕزگار ئەبی هەر بە ئیتیفاق

٥. گەلۆ، ئەڤە چەند ساڵە؟

ژینا مە تیژو تاڵە.

٦. ئەڤە ژ کەنگی؟

وێرانی هات ڤی چەنگی

بەڕو گێسن بوونە ژەنگی

ترس‌و سەهم لێرە پەنگی

بۆچی تو هۆ یێ بێ دەنگی؟ (ف.م)

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| لنك | : | لەکن |
| ڕوونیشت | : | دانیشت |
| زۆزان | : | کوێستان |
| لکیڤە | : | لەکوێ، لکیرێ |
| کێوی | : | کیڤی |
| ئاڵ | : | سوور |
| ئێمە | : | مە |
| بەم جۆرەیە | : | ب ڤی ڕەنگی |
| خێرا | : | زوی. بلەز |
| لاتان بوو | : | لنك وە بوو |
| کوێستانان | : | زۆزانان |
| مەڕ | : | پەز |

# ڕستەی لێکدراو

**١. نازداریٚ فراڤین لێناو شەرمینیٚ مالٚ پاقژکر.**

**٢. دیٚ چیرۆکیٚ خوینم پاشی دیٚ نقم.**

**٣. نانم خوارد لە پاشان نامەکەم نووسی ئەمجا نووستم.**

**٤. قسە هەزارە بەلاّم دووانی بە کارە.**

## خستنە ڕوو:

خوێندوومانە کە ڕستەی سادە ڕامانێکی تەواوی هەیە، لە (بکەرو کارێك) یان (نیهادو کاری ناتەواو) پێك دهێتو یەك کاری تێدایە، جا کارەکە (تەواو– ناتەواو)بێت.

دەبێت بزانین ئەو ڕستانەی کە لە ئاخاڤتندا دەردەبڕێن هەمیشە سادە نین، واتە مەرج نییە یەك کاری تێدا هەبێت، ڕستەی وا هەیە بە (دوو کار یان پتر) واتا کەی پێك دێت، ئینجا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە ئەگەر لە ڕستەکانی سەرەوە وردبینەوە دەبینین:

١. ڕستەی یەکەم لە دوو ڕستەی سادەی سەربەخۆ پێکهاتووە ڕستەی (نازداریٚ فراڤین لێنا)و ڕستەی (شەرمینیٚ مال پاقژکر). ئەم دوو ڕستەیە هەر چەندە لە ڕاماندا سەربەخۆن بەلاّم پەیوەندی لە نێوان هەردووکیاندا هەیە کە بە یاریدەی ئامرازی (و)ی لێکدەرەوەکە سەر بە هیچیانەوە نییە هەردوو ڕستەکەی بە یەکەوە بەستووە، بۆیە بە هەردووکیان بەسەر یەکەوە دەگوترێت (ڕستەی لێکدراو).

٢. ڕستەی دووەم لە دوو ڕستەی سادەی سەربەخۆ پێکهاتووە، ڕستەی (دێ چیرۆکێ خوینم)و ڕستەی (دێ نقم) ئەم دوو ڕستەیە هەر چەندە لە واتادا سەربەخۆن بەڵام پەیوەندییەك لەنێوانیاندا هەیەو کە بە یاریدەی ئامرازی (پاشی)ی لێکدەرەوە کە سەر بە هیچیان نییە بە یەکەوە بەستراون بۆیە بەهەردووکیان بەسەر یەکەوە دەگوترێت (ڕستەی لێکدراو).

٣. ڕستەی سێیەم لە سێ ڕستەی سەربەخۆ پێکهاتووە، ڕستەی (نانم خوارد)و ڕستەی (نامەکەم نووسی)و ڕستەی (نووستم) ئەم سێ ڕستەیە هەر چەندە لە ڕاماندا سەربەخۆن بەڵام پەیوەندییەك لەنێوان هەر سێکیاندا هەیە کە یەکەم‌و دووەمیان بە یاریدەی گرێی (لە پاشان)ی لێکدەرەوە کە سەر بە هیچیان نییە بە یەکەوە بەستراون.

هەروەها ڕستەی دووەم‌و سێیەمیش بەیاریدەی ئامرازی (ئەمجا)ی لێکدەرەوە دراونەتە پاڵ یەکتر.

بۆیە بەم سێ ڕستەیە بەسەر یەکەوە دەگۆترێت (ڕستەی لێکدراو).

٤. ڕستەی چوارەم لە دوو ڕستەی سادەی سەربەخۆ پێکهاتووە، ڕستەی (قسە هەزارە)و ڕستەی (دووانی بەکارە).

ئەم دوو ڕستەیە هەر چەندە لە واتادا سەربەخۆن بەڵام پەیوەندییەك لەنێوانیاندا هەیە کە بەیاریدەی ئامرازی (بەڵام)ی لێکدەرەوە کە سەر بە هیچیان نییە بە یەکەوە بەستراون بۆیە بەم دوو ڕستەیە بەسەر یەکەوە دەگۆترێت (ڕستەی لێکدراو).

## دەستوور:

ڕستەی لێکدراو ئەو ڕستەیەیە کە لەدوو ڕستەی سەربەخۆی سادە یان پتر پێک دێت پەیوەندییەک لەنێوانیاندا هەیەو بە یاریدەی ئامراز یان گرێی لێکدەرەوە دەدرێنە پاڵ یەکتر.

ئامرازی لێکدەر سەر بە هیچ ڕستەیەکی سادەی ناو ڕستە لێکدراوەکە نییە، لە ڕستەی لێکدراودا چەند کار هەبێت ئەوەندە ڕستەی سادەی تێدایە[1].

زۆربەی ئەو ئامراز یان گرێ لێکدەرانەی کە بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهێنرێن ئەمانەن:

(و، ئەمجا (ڤێجا)- ڤیجا، بەڵام- لێ - بەلێ، لە پاشا (لە پاشان)- پاشی- پشتی هینگێ، لە دواییدا، چونکە، یان، یاخود، ژنوو، نەکۆ- نەک- بەڵکو، کەچی، تا- تاکو- هەتاکو، هەتا، لدویڤدا، لدویڤرا، کە... هتد).

---

(١) ڕستەی وا هەیە دوو بکەری تێدایەو یەک کاریان ئەنجام داوە، بۆ سووک کردن ڕستەی لێکدراو کورت کراوەو پەیڤە دووبارەکان لادراون وەک: ئازادو دلێر چوون بۆ هەولێر.

ئەم ڕستەیە خۆی بەم شێوەیە بووە:

ئازاد چوو بۆ هەولێرو دلێر چوو بۆ هەولێر (چوو بۆ هەولێر) لە هەردوو ڕستەدا دووبارە کراوە.

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستە سادانە بە ئامراز یان گرێیەکی لێکدەر بگۆڕە بۆ ڕستەی لێکدراو:

١. شڤانی پەز چەراند، ئاڤ نەدا.

٢. نامەیەکێ بنڤیسە، بۆ زناریێ بهنێرە.

٣. هاوڕێ سواری ترۆمبێلەکە بوو، چوو بۆ هەولێر، چوو بۆ دهۆك.

٤. ئەم کوڕە زیرەکە، ئەو کوڕە تەمەڵە.

٥. برینێن خەنجەران ساخ دبن، برنێین خەبەران ساخ نابن.

٦. یان بڕۆ، دەرگاکە پێوە دە.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ئامرازانەی خوارەوە ڕستەی لێکدراو پێك بهێنە:

(بەلێ، پاشی، کەچی، نەکۆ، پشتی هینگێ، ئەمجا، نەك، لە دواییدا).

## ڕاهێنانی (٣)

هەر یەکە لەم ڕستە لێکدراوانەی خوارەوە بکە بە ڕستەی سادە:

١. شێرکۆ چوو بۆ لای چەتۆ بەڵام چەتۆ لە ماڵ نەبوو.

٢. دوژمن هێمن بکەوە ئەمجا تەپ بدە سەری.

٣. هەڤالێد من نەهاتن چونکە بەفر باری بوو و ڕێ هاتبوو گرتن.

٤. دلشێری چیرۆکا مەمو زینێ خواندو نامەیەك نڤیسی پاشی نڤست.

٥. ڕزگار هەڵبەستەکە لەبەر دەکات و پەخشانەکە دەنووسێتەوە.

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم بۆشاییانە بە ئامرازێکی لێکدەر پڕ بکەوە:

١. شام شەکرە .......... وەڵات شیرنترە.

٢. سیپەل نەچوو بۆ قوتابخانە .......... نەخۆش بوو.

٣. ڤیێ سروودیێ بخوێنە .......... ژ بەرکە.

٤. ئەسپەکەت پێم بفرۆشە .......... پێم ببەخشە.

٥. ڕەزڤانی گولێ چاند .......... ئاڤ دەدا.

## ڕاهێنانی (٥)

ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

١. نەمامەکەم چاند بەڵام تۆوەکەم هەڵگرت.

٢. زەنگەکە لێ درا، ئەمجا قوتابییەکان چوونە ژوورەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

تۆو : تۆڤ

# ئامرازی پەیوەندی

ئـ/

١. کاروان دەچێت بۆ زاخۆ.

٢. بەختیار لە قوتابخانەدا دەخوێنێت.

٣. چیمەن لە کەرکووک ڕا هاتووە.

٤. ئازاد نامەکەی لە هەولێرەوە ناردووە.

٥. سەردار ل مالێ ڕوونیشتی یە.

٦. سێڤ ژ دارێ وەرین.

٧. سالار دمال دا کار دکەت.

٨. نامەکەم بە پۆستەدا ناردووە.

٩. وێنەکەی بە دیوارەوە هەڵواسیوە.

١٠. گەل ب زانینێ پێش دکەڤیت.

١١. نەسرین تا ڕەواندزێ چوو.

١٢. مامۆستا وەك باوکە.

١٣. قوتابییەکە بێ ئێوە هیچ ناکات.

١٤. سەرهەنگ دەچێتە ئاکرێ.

ب/

١. من لە بۆ تۆمە، تۆ لەبۆ کێتە؟

٢. تە نامە ژ بۆ وان نڤیسییە.

٣. ترێ هەتاکو پاییزێ دەمێنێت.

٤. منداڵەکە بەبێ باوکی گوزەران ناکات.

**٥. کاوه لەگەڵ برادەرەکانی ڕاوەستاوە.**

**٦. هەژار دگەل مەدژیت.**

**٧. نازەنین بەرەو قوتابخانە هات.**

**٨. ئاوات بەر ب مال ڤە چوو.**

## خستنە ڕوو:

یەکەم :- ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) بکەین، دەبینین لە هەر ڕستەیەکدا ئامرازی پەیوەندی هەیەو کەوتۆتە پێش ناوێك یا جێناوێك بۆ پیشاندنی پەیوەندی نێوان ئەو ناوە یا ئەو جێناوە لەگەڵ ناوێکی تری ڕستەکە. وەکو:

١. لە ڕستەی یەکەمدا وشەی (بۆ) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، پەیوەندی نێوان ناوی کاروان‌و زاخۆی پیشان داوە، کە کاروان دەچێت بۆ زاخۆ نەوەك بۆ شوێنێکی تر.

٢. لە ڕستەی دووەمدا وشەی (لە– دا) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، پەیوەندی نێوان ناوی بەختیارو قوتابخانەی پیشان داوە، کە بەختیار لە قوتابخانەدا دەخوێنێت نەوەك لە جێگەیەکی تردا.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا وشەی (لە– ڕا) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، پەیوەندی نێوان ناوی چیمەن‌و کەرکووکی پیشان داوە، کە چیمەن لە کەرکووك ڕاهاتووە نەوەك لە شوێنێکی تر.

٤. له ڕستەی چوارەمدا وشەی ( لە- ەوە) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، پەیوەندی نێوان ناوی ئازادو هەولێری پیشان داوە، کە ئازاد لە هەولێرەوە نامەکەی ناردووە نەوەك لە جێگەیەکی تر.

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا وشەی (ل) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، پەیوەندیی نێوان ناوی سەردارو ماڵی پیشان داوە، کە سەردار ل ماڵ ڕوونیشتییە نەوەك لە شوینێکی تر.

٦. لە ڕستەی شەشەمدا وشەی (ژ- ێ) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، چونکە پەیوەندی نێوان سێڤو داری پیشان داوە، کە سێڤ لە داری وەریوە نەوەك لە شتێکی تر.

٧. لە ڕستەی حەوتەمدا وشەی (د- دا) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، پەیوەندی نێوان سالارو ماڵدا پیشان داوە، کە سالار لە ماڵدا کار دکەت نەوەك لە شوێنێکی تر.

٨. لەڕستەی هەشتەمدا وشەی (بە- دا) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، پەیوەندی نێوان ناوی نامەو پۆستە پیشان داوە، کە نامە بە پۆستەدا ناردراوە نەوەك بەشتێکی تر.

٩. لە ڕستەی نۆیەمدا وشەی (بە- ەوە) ئامرازی پەیوەندی سادەیە چونکە پەیوەندی نێوان ناوی وێنەو دیواری پیشان داوە، کە وێنە بە دیوارەوە هەڵواسراوە نەوەك بە شتێکی تر.

١٠. لە ڕستەی دەیەمدا وشەی (ب- ێ) ئامرازی پەیوەندی سادەیە کە پەیوەندی لەنێوان ناوی گەلو زانینی پیشان داوە، کە گەل ب زانین پێش دەکەوێت نەوەك بە شتێکی تر.

١١.له ڕستەی یازدەمدا وشەی (تا– یٚ) ئامرازی پەیوەندی سادەیە چونکە پەیوەندی نێوان ناوی نەسرینو ڕەواندزی پێشان داوە، کە نەسرین تا ڕەواندزیٚ چووە نەوەك زیاتر.

١٢.له ڕستەی دوازدەمدا وشەی (وەك) ئامرازی پەیوەندی سادەیە کە پەیوەندی نێوان ناوی مامۆستاو باوکی پیشان داوە، کە مامۆستا وەکو باوکە بۆ قوتابی نەوەك وەکو کەسێکی تر.

١٣. له ڕستەی سێزدەمدا وشەی (بێ) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، کە پەیوەندی لەنێوان ناوی قوتابییەکەو جێناوی ئێوەی پیشان داوە، کە قوتابییەکە بیٚ ئێوە هیچ ناکات وەك کەسانی تر.

١٤.لەڕستەی چواردەهەمدا وشەی (ە) ئامرازی پەیوەندی سادەیە، کە پەیوەندی نێوان ناوی سەرهەنگو ئاکرێی پیشان داوە، کە سەرهەنگ دەچێتە ئاکریٚ نەوەك شوێنێکی تر.

وەم: – هەروەها ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) بکەین، دەبینین کە لەهەر ڕستەیەکدا ئامرازی پەیوەندی هەیە بەم شێوەی خوارەوە.

١– له ڕستەی یەکەمدا وشەی (لەبۆ) ئامرازی پەیوەندی لێکدراوە کە پەیوەندی نێوان جێناوی منو تۆی پیشان داوە، هەروەها پەیوەندی نێوان تۆو کێی پیشان داوە.

٢– لەڕستەی دووەمدا وشەی (ژبۆ) ئامرازی پەیوەندییە کە پەیوەندی نێوان ناوی نامەو جێناوی وان پیشان داوە، کە نامە بۆ وان نووسراوە نەوەك بۆ یەکێکی تر.

٣- له ڕستەی سێیەمدا وشەی (هەتاکو) ئامرازی پەیوەندی لێکدراوە کە پەیوەندی لەنێوان ناوی ترێو پاییزی پیشان داوە، کە ترێ هەتاکو پاییزێ دەمینێت نەوەك وەرزێکی تر.

٤- له ڕستەی چوارەمدا وشەی (بەبێ) ئامرازی پەیوەندی لێکدراوە، کە پەیوەندی نێوان ناوی منداڵەکەو باوکی پیشان داوە، کە منداڵەکە بەبێ باوکی گوزەران ناکات نەوەك کەسێکی تر.

٥- له ڕستەی پێنجەمدا وشەی (لەگەڵ) ئامرازی پەیوەندی لێکدراوە، کە پەیوەندی نێوان ناوی ئازادو برادەرەکانی پیشان داوە، کە ئازاد لەگەڵ برادەرەکانی ڕاوەستاوە، نەوەك لەگەڵ کەسانی تر.

٦- له ڕستەی شەشەمدا وشەی (دگەل) ئامرازی پەیوەندی لێکدراوە، کەپەیوەندی نێوان ناوی هەژارو جێناوی (مە)ی پیشان داوە، کە هەژار دگەل مە دژیت نەوەك دگەل یەکێکی تر.

٧- له ڕستەی حەوتەمدا وشەی (بەرەو) یا (بەرەڤ ) ئامرازی پەیوەندی لێکدراوە، کە پەیوەندی نێوان ناوی نازەنینو قوتابخانەی پیشان داوە، کە نازەنین بەرەو قوتابخانە هات نەوەك شوێنێکی تر.

٨- له ڕستەی هەشتەمدا وشەی بەر ب= (بەرەو) ئامرازی پەیوەندی لێکدراوە کە پەیوەندی نێوان ناوی ئاواتو ماڵی پیشان داوە، کە ئاوات بەر ب (بەرەو) مال ڤەچوو نەوەك شوێنێکی تر.

## دەستوور:

**ئامرازی پەیوەندی: ئەو وشەیەیە کە لەڕستەدا لە پێش ناوێك یا جێناوێك دێت بۆ پیشاندانی پەیوەندی نێوان ئەو ناوە یا ئەو جێناوە لەگەڵ ناوێکی تری هەمان ڕستە.**

**ئامرازی پەیوەندی دوو جۆرە:**

**ئـ- ئامرازی پەیوەندی سادە: ئەوەیە کە لە یەك وشە پێکهاتووە وەك: (بۆ، لە- دا، لە- را، لە- ەوە، ل – دا، ژ- ێ، ژ- را، د- دا، بە- دا، بە- ەوە، ب- دا، تا- ێ، وەك، بێ، ە).**

**ب- ئامرازی پەیوەندی لێکدراو: ئەوەیە کە لەدوو وشە یا پتر پێکهاتووە وەك: (لەبۆ، ژبۆ- ڕا، هەتا، هەتاکو، هەتا وەکو، بەبێ، لەگەڵ، دگەل، بەرەو، بەرەڤ، بەر ب).**

## ڕاهێنانی (١)

پێنج ڕستە بهێنەوە کە ئامرازی پەیوەندییان تێدا بێت دووانیان ئامرازی پەیوەندی سادە بن و سێیانیان ئامرازی پەیوەندی لێکدراو بن.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستەی خوارەوەدا

(تا ناو دارستانەکە چووین)

ئـ. وشەی (تا) شی بکەوە:

ب. وشەی (دارستانەکە) چ جۆرە ناوێکە لە ڕووی داڕشتنییەوە؟ چۆن پێکهاتووە؟

ت. بکەری ڕستەکە دیار بکە.

لە وشەی (تا) ئامرازی پەیوەندی لێکدراو دروست بکەو لەڕستە بەکاری بهێنە.

ج. لەکاری (چوو) کاری ڕانەبوردوو، داخوازی دروست بکە.

چ. وشەی (تا) وەکو ئامرازی لێکدەر لە ڕستەدا بەکاربهێنە.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم دێڕە هۆنراوانەی خوارەوە ئامرازی پەیوەندی دەربهێنەو جۆرەکانی دیاربخە:

ئـ- بسکان ل ڕووی نێ بوونە کۆم

جامێ مەیێ ئینا ژ بـــــۆم

حوکمێ دکر لازم ڤەخـــــۆم

مەستی ل من جاری ت کەن (عەلی حەریری)

ب- دیسا ژ نو عەشقا بەرێ پڕ ئەندەروونم ئاتەشــە

زولفا موزەیەن عەنبەری دەعوا دگەل خالا ڕەشە (عەلی حەریری)

پ- پڕ ژ دیتنا تە غەریبم خانـــــــم

ژ تە سەرتا ب قەدەم حەیرانـــم

هەر ب جان تەشنە لەبێ لەعلانم

دل‌و بەندا گرها زولفانـــــــم

عاشقێ نازك‌و مەحبووبانـــــم

تو مەبین بێ سەرو بێ سامـــانم

گولی باغێ ئیرەمی بۆتانـــــم

شەب چراغی شەبی کوردستانم (مەلای جزیری)

ت- بە ئاسمانەوە ئەستێرەم دیوە

لە باخچەی بەهار گوڵم چنیوە (گۆران)

# ئامرازی دانە پاڵ (خستنە سەر)

١. گوڵی باخەکە جوانە.

٢. برادەری ئێوە دڵسۆزە.

٣. من بۆیە گوڵی سوورم خۆش دەوێ
موژدەی شەفەقی لێ دەردەکەوێ.

٤. بابێ ئازادی پێشمەرگەیە.

٥. دایکا نازداری پزیشکە.

٦. ل چیایێت کوردستانێ بەفر دباریت.

٧. هەڤالێن مە هاتن.

٨. مرۆڤێد زیرەك سەر دکەڤن.

## خستنە ڕوو:

ئەگەر سەیری ڕستەکانی سەرەوە بکەین، دەبینین لە هەر ڕستەیەکدا ئامرازی دانە پاڵ (خستنە سەر) هەیە کە ناوێکی داوەتە پاڵ ناوێکی تر، یا ناوێکی داوەتە پاڵ جێناوێك، یا ناوێکی داوەتە پاڵ هاوەڵناوێك، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. لە ڕستەی یەکەمدا ئامرازی (ی) لەنێوان ناوی گوڵو باخدا، ئامرازی دانە پاڵە چونکە ناوی (گوڵ)ی داوەتە پاڵ ناوی (باخەکە).

٢. له ڕستەی دووەمدا ئامرازی (ی) له نێوان ناوی (برادەر)و جێناوی (ئێوه)، ئامرازی دانه پاڵه چونکه ناوی برادەری داوەته پاڵ جێناوی ئێوه.

٣. له ڕستەی سێیەمدا ئامرازی (ی) لەنێوان ناوی (گوڵ)و هاوەڵناوی (سوور)، ئامرازی دانه پاڵه، چونکه ناوی (گوڵ)ی داوەته پاڵ هاوەڵناوی (سوور).

٤. له ڕستەی چوارەمدا ئامرازی (یّ) لەنێوان ناوی (باب)و ناوی (ئازاد)، ئامرازی دانه پاڵه چونکه ناوی (باب)ی داوەته پاڵ ناوی (ئازاد).

٥. له ڕستەی پێنجەمدا ئامرازی (ا) لەنێوان ناوی (دایك)و ناوی نازدار، ئامرازی دانه پاڵه چونکه ناوی (دایك)ی داوەته پاڵ ناوی (نازدار).

٦. له ڕستەی شەشەمدا ئامرازی (ێت) لەنێوان ناوی (چیا)و ناوی (کوردستان)، ئامرازی دانه پاڵه، چونکه ناوی (چیا)ی وەك ناوێکی کۆ دراوەته پاڵ ناوی (کوردستان).

٧. له ڕستەی حەوتەمدا ئامرازی (ێن) لەنێوان ناوی هەڤاڵو جێناوی (مه)، ئامرازی دانه پاڵه، چونکه ناوی (هەڤاڵ)ی وەك ناوێکی کۆ داوەته پاڵ جێناوی (مه).

٨. له ڕستەی هەشتەمدا ئامرازی (ێد) لەنێوان ناوی (مرۆڤ )و هاوەڵناوی زیرەك، ئامرازی دانه پاڵه، چونکه ناوی مرۆڤی وەك ناوێکی کۆ داوەته پاڵ هاوەڵناوی زیرەك.

**دەستوور:**

**ئامرازی دانە پاڵ (خستنە سەر) ئەو وشەیەیە کەلە ڕستەدا ناوێک دەداتە پاڵ ناوێکی تر، یا ناوێک دەداتە پاڵ جێناوێک یا هاوەڵناوێک بەم شێوەی خوارەوە:**

١. **ئامرازی (ی) ناوی نێرو مێی تاکو کۆ دەداتە پاڵ ناوێکی تر، یان جێناوێک یا هاوەڵناوێکی چۆنی.**
٢. **ئامرازی (ێ) ناوی نێری تاک دەداتە پاڵ ناوێکی تر، یا جێناوێک یا هاوەڵناوێکی چۆنی.**
٣. **ئامرازی (أ) ناوی مێی تاک دەداتە پاڵ ناوێکی تر یا جێناوێک یا هاوەڵناوێکی چۆنی.**
٤. **ئامرازی (ێت- ێد- ێن) ناوی نێرو مێی کۆ دەداتە پاڵ ناوی تر یا جێناوێک یا هاوەڵناوێکی چۆنی.**

## ڕاهێنانی (١)

پێنج ڕستە بهێنەوە ئامرازی دانە پاڵی تێدا بێت سێیان بۆ ناوی تاک بنو دووانیان بۆ ناوی کۆ بن.

## ڕاهێنانی (٢)

جیاوازی لەنێوان ئامرازی پەیوەندیو دانە پاڵ چییە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم ڕستەی خوارەوەدا:

**(دەستکەوتەکانی ڕاپەڕین دەپارێزین )**

ئـ– (ی) لەنێوان وشەی دەستکەوتەکان و ڕاپەڕین چییە؟

ب– ئایا دەتوانین وشەیەکی تر لەجیاتی (ی) بەکار بهێنین؟ چۆن؟

پ– بکەری ڕستەکە دیار بخە، بۆچی خراوەتە ئەوێ؟

ت– وشەی دەستکەوتەکان شی بکەوە.

ج– دەپارێزین بە پێی کاتەوە چ جۆرە کارێکە؟ چۆن دروست کراوە؟

چ– لە کاری دەپارێزین کاری ڕابوردووی ڕاگەیاندن (ئیخباری) بە پێی دەم دروست بکە.

ح– لە کاری دەپارێزین کاری ڕابوردووی نزیکی دانانی دروست بکەو لە ڕستەدا بەکاری بهێنە.

خ– لە کاری دەپارێزین کاری ڕانەبوردووی ئاییندە دروست بکە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

نیێ بونە کۆم : خڕ بوونەوە، کۆبوون.

ئینا بۆم : بۆی هێنام، هێنای بۆم

لازم ڤەخۆم : دەبێ بیخۆمەوە

ت کەت : دەکەن

عشقا بەری : عشقی پێشوو

ئەندەروونم : هەناوم

ئاتەشە : ئاگرە

ژ تە سەر تا ب قەدەم حەیرانم: قوربانی تۆم لە تەوقی سەرەتەوە تا پێت

تومەبین : مەبینە

# ﴿ بەشی ئەدەب ﴾

١. ئەدەب

٢. جۆرو مەبەستەکانی هۆنراوە.

٣. فۆلکلۆر چییە؟

٤. داستان.

٥. مێژووی داستان لە جیهاندا.

٦. داستانی ڕۆژهەڵات.

٧. لە فۆلکلۆرەوە بۆ نووسین.

٨. داستانی کوردیو بەشەکانی.

٩. پەندی پێشینان.

١٠. لێکۆڵینەوەی تازەی ئەدەبی کوردی.

١١. مەلایێ جزیری.

١٢. حاجی قادری کۆیی.

١٣. وەلی دێوانە.

١٤. پیرەمێرد.

١٥. گۆران.

١٦. هەژاری موکریانی.

١٧. دیلان.

١٨. سەبری بۆتانی.

١٩. مقداد مەدحەت بەدرخان.

٢٠. شاکر فەتاح.

# بەشی ئەدەب

## ئەدەب:

وشەی ئەدەب کە (وێژە)شی پیٚ دەگوترێت، بە دوو واتای جودا بەکاردێت، یەکەمیان واتای تایبەتییە کە بە مەبەست پێی ئەو ئاخافتن‌و گوتراوە نایابانەن کە خۆشی‌و شادی دەخەنە دڵی گوهدارو خوێنەرانەوە، جا گوتراوەکان هۆنراوە بن یا پەخشان، هەڵبەستی نایاب‌و هۆزانی بەرزو چیرۆکی خۆش‌و گوتاری ناوازەو گەلەك بەشی دی دەکەونە ژێر ئەم پێناسەوە، چونکە دێنە خوێندنەوەو گوهـ لیٚ بوون، چەشەو لەزەتێکی هونەرییان لیٚ دێتە وەرگرتن.

واتای گشتی (ئەدەب)یش، ئەو بەرهەمی مێشکی مرۆڤە دەگرێتەوە کە لەشێوەی ئاخافتندا خۆی دەنوێنێت‌و لە لاپەڕەی کتێباندا دێتە نڤیسین لەم بارەیەوە کتێبی ڕێزمان‌و کتێبی وەرزش‌و سروشت زانی ئەدەبێکن بە واتای گشتی.

چونکە بەرهەمی هەمە چەشنی مێشکی مرۆڤ دەنوێنن کە مەرج نییە لە کاتی خوێندنەوەیاندا ئەو خۆشی‌و لەزەتەیان لیٚ وەربگیرێت کە لە ئەدەبی واتای تایبەتی وەردەگیرێن.

## ئەدەب لەسەر چوار ڕەگەزان دامەزراوە کە ئەمانەن:

١. **سۆز**: کار دەکاتە سەر ئەندێشەو دڵ‌و وا دەکات کە بە ئارەزوویەکی خۆشەویستانە بشنێتەوە.

٢. **بیر:** بیر یا (فیکرە)ی ئەدیبو نووسەر ڕەگەزی بنەڕەتی بەرهەمی ئەدەبییە.

٣. **ئەندێشە:** ئەویش خەیاڵێکی تیژ تێپەڕی پەنهانییە لەدڵدا، ئەندێشە نەبێ ئیشی هونەرە ئاشکراییەکانی ئەدەب دەوەستێ.

٤. **واتا:** واتای مەبەستەکە ڕوون دەکاتەوەو لەڕووی وشەو ڕستەوە بە جوانی دایدەڕێژێ تا سۆزو ئەندێشەکە ڕوون بکاتەوە.

## مێژووی ئەدەب:

مێژووی ئەدەب بەشێکە لە مێژووی گشتی نەتەوە بە تێکڕا دەکەوێتە بەر بەرنامەکانی مێژوو، لەدیرۆكو مێژووی گشتیدا هەندێك ڕاستی هەنو باس دەکرێن کە سەر بە سەردەمی ڕابوردوونو لەگەڵ ئێستادا پەیوەندییان بڕاوە.

بەڵام لە مێژووی ئەدەبدا، هۆنراوەو پەخشان هەر کاریگەرنو زیندوون، چونکە توانای وروژاندنی بیرو سۆزیان هەیە.

مێژووی ئەدەبی هەر نەتەوەیەکیش کاتێك پەیدا دەبێت کە ئەو نەتەوەیە سامانێکی ئەدەبی لا پەیدا ببێت کە شایانی نووسینەوەو مێژوو بۆ دانان بێت. مێژووی ئەدەب زانستێکە باس لە چۆنیەتی زمانو ئەو هۆنراوەو پەخشانە جوانانە دەکات کە بۆمان بەجێ ماون، بەرزیو نزمییان دەردەخات، لە کاروبارو ژیانی هۆزانڤانو نووسەرو ئەدیبانیش دەدەوێت هەروەها بەرهەمەکانیشیان هەڵدەسەنگێنێت.

## ڕەخنەی ئەدەبی:

دیارە هەر لەو دەمەی خەڵك گوێیان لە هۆنراوەی شاعیران یا خوتبەو شتی تربووە، هەندێکیان بیروڕای خۆیانیان دەربڕیوە، ستایشی بەرهەمەکانیان کردووە، یانیش کەمو کورتییان پیشان داون، کە ئەوەیان یەکەم شێوەی ڕەخنەی ئەدەبی بووە، لە پاشان وردە وردە پەرەی پێ دراوەو پێشکەوتووە تا وای لێ هاتووە ببێتە خاوەنی چەند ڕێو شوێنێکی تایبەتی بەشێوەیەکی وا کە لە دواییدا بووبێتە هونەرێکی نایابی سەربەخۆ.

دیارە ڕەخنە هەر لەگەڵ پەیدا بوونی ئەدەبدا پەیدا بووە کە لەم لایەنەوە پێش مێژووی ئەدەب کەوتووە، چونکە وا دەرکەوتووە کە شاعیرو هۆزانڤانە کۆنەکانی عەرەبو نەتەوەکانی تر هەر خۆشیان ڕەخنەگر بوون، بۆ نموونە (ئەرستۆڤان) یەکەم ڕەخنەگری یۆنانی شاعیر بووەو یەك ڕۆمانی دوورو درێژی بە ناوی (بۆقەکان) تەرخان کردووە بۆ ڕەخنەگرتن لە هەر سێ شاعیری تراژیدی یۆنان (سۆفۆکلیس)و (یۆروپیدس)و (ئەشیل)، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین کە ڕەخنەگرانی بەرایی شاعیر بوون.

سەرەتای ڕەخنەسازیی لە ئەدەبی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەمی زایینیو لەم بوارەدا ( ئەحمەدی خانی) شاعیر پێشەنگ بووە، هەروەها (حاجی قادری کۆییش) لە ڕەخنەدا جێ پەنجەی دیارە. ڕەخنەی ئەدەیش بریتییە لە هونەری لێکۆڵینەوەو توێژینەوەو لە یەك جوداکردنەوەی شێوازەکان، ئەوەشیان ڕێبازی گشتی نووسەرو جۆری

دەربڕینو بیرکردنەوەیو هەستو سۆزی دەگرێتەوە، واتە شێوازی تایبەتی نووسەر هەموو ئەو ڕەگەزانە دەگرێتەوە کە ناومان بردن.

## دابەشکردنی ئەدەب:

یەکەم دیاردەی ئەدەبی کە خەڵك پێی ئاشنا بوونو چەشنە خۆشیو لەزەتێکی خستە ناو دڵو دەروونیان هۆنراو بووە، هۆنراویش ئەو ئاخافتنەیە کە دەربڕینەکەی پشت بە کێشو مۆسیقاوە دەبەستێتو لە چەند بەشێکی یەکسان لە درێژیو کورتیو جولانەوەو نەجوولان دا پێك دێت، لە واتاشدا لەسەر وێنە کێشانو پیشاندانی سۆزو ئارەزووی خەڵکی دادەمەزرێت، کە لێرەدا خەیاڵو ئەندێشە دەسەڵاتی گەورەی دەبێت، سەرەڕای کێش، لە هۆنراوەدا سەرواش هەیە، بەڵام هۆنراوەی ئازاد ئەوەندە بایەخ بە سەروا نادات. هۆنراوە یەکەم هۆ بووە کە مرۆڤ خۆشیو ناخۆشی، شادی نا شادی، ئومێدەواریو بێ ئومێدی خۆی پێ دەربرێت، لە مێژووی هەندێك نەتەوەدا هەموو سامانی عەقڵی نەتەوەکە پێك دێنێت کە سۆزی خۆی پێ پیشان دەداتو زانستو زانیاریشی پێ دەردەبڕێت، دیارە لەگەڵ پێشکەوتنی ڕۆژگاردا شارستانیەتی گەلان پێش دەکەوێتو سەردەمانێك دێنە پێش کە مرۆڤ گەورەترین دەسکەوت وەدەست دێنێت کە ئەویش دۆزینەوەی (نووسین) بووە، بۆ ئەوەی بتوانێت هەندێك لە دۆزینەوەی زانستییەکانی خۆیو کارەساتەکانی سەردەم لە شێوەی ئاخافتنو گوتراوێکی بێ کێشو بێ سەروا تۆمار بکات، ئا لێرەدا دووەم دیاردەی ئەدەب پەیدا دەبێت کە پەخشانە، کە لە پەخشان ئەو ئاخافتنو گوتراوەیە کە کێشو مۆسیقاو

سەروا بەربەستی ناکات، بەڵکو تەنیا هەر بە نووسین بەربەست دەبێت‌و زیاتر پشت بە بیرکردنەوەی وردەوە دەبەستێت.

## جۆر و مەبەستەکانی هۆنراوە:

زانیمان کە هۆنراوە کۆنترین جۆری ئەدەبە و ئەگەر بە چاوی لێکۆڵینەوە تەماشای بەرهەمی ئەدەبی جیهان بکەین دەبینین کۆنترین پاشماوەی ئەدەبی مرۆڤ هۆنراوە بووە، ئەوەتا لە یۆناندا هۆنراوەکانی (هۆمیرۆس) دەکەونە پێش هەموو جۆرە پەخشانێك، لە ئەدەبی عەرەبیش دا بەر لە هاتنی ئیسلام هۆنراوە لە کۆڕو کۆمەڵەکان دا گوتراوە لەکاتێکدا پەخشان زۆر دەگمەن‌و کەم بووە. ئەم دیاردەیە لە ئەدەبی کوردیدا ئاشکراترە چونکە هۆنراوەکانی (بابا تاهیری هەمەدانی ٩٣٥– ١٠١٠ز) کۆنترین بەرهەمی ئەدەبیمانن کە تا ئێستا لەبەر دەستان بن، پەخشانی کوردیش زۆر دوای ئەمە پەیدا بووە.

## گرنگترین جۆرکانی هۆنراوەش بریتین لە:

### ١. هۆنراوەی گۆرانی:

ئەم جۆرەیان زمانی ویژدانەو شان بەشانی گۆرانی‌و ستران ڕۆیشتووە، دیارە گۆرانی‌و ستران ژی لەکن هەموو نەتەوەیەك باوەو کەس لێی بێ بەش نییە، بۆ نموونە نالی (١٨٠٠– ١٨٧٣ز) دەڵێ:

**چاوی من دەم دەم دەڕێژێ ئاوی ساف‌و خوێنی گەش**

**تا بڵێن دەریای عومانە دوڕو مەرجانی هەیە**

( نالی )

(بۆ لەبەرکردنە)

### ٢. هۆنراوەی شەڕو شۆڕ:

ئەم جۆرە هۆنراوە دەگرێتەوە کە پەیوەندی بە جەنگو پێك دادانو ئازایەتیو لە خۆ بوردنو تۆڵە ستاندنو شانازی کردن بە خزمو کەسو کارو عەشیرەتەوە هەیە، لێرەدا هۆزانڤان باسی خۆی ناکات، بەڵکو پتر باسی ئەو قارەمانانە دەکات کە کارەساتەکان دەکەن، وەك ئەم چەند دێڕەی خوارەوە کە ئازایەتی (شەریف هەمەوەند) پیشان دەدات لەو جەنگەی کە دەگەڵ بابانەکان دا کردی.

یاخوا سەربازان پەنجەیان بشکێ
گوللەکیان دا بوو لەگۆیێ مەمکێ
لە جێی ئەو گوللەی زوخاو دەتکێ
قەلغانی زەردە ماینی باڵەکان
دەنگی تەپڵیان دێ لەگردی سەیوان
هاوار وەرگەڕێ، تالان وەرگەڕێ
پاش شەریفی کەس، با، نەکا شەڕێ

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

### ٣. هۆنراوەی لاسایی:

ئەم جۆرەشیان وەکو دەمەتەقێی نێوان دوو کەسانی لێ دێتو دیمەنێکی بینراویشی لەگەڵدا دەبێت، چونکە هۆنراوەی سەر شانۆیە، هۆنراوەی لاساییش دوو جۆرە، بەزمەسات (کومیدیا)و مەرگەسات

(تراژیـدیا). نموونەشـی لـە ئـەدەبی کوردیـدا ئـەم هـۆنراوەی هـەژاری موکریانییە:

- مام بایز ڕۆژباش
- (علیك السـلام)
- ئەمە یانی چـی؟
- جیرانی مـــەلام
- نەم دی دوێنێو پێر
- بەخوا چوومە شار
- چیت فرۆشت بەخێر؟
- یەك دووبارە دار
- نرخەکەی چۆن بوو؟
- بۆتە چوار قیمەت.

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## ٤. هۆنراوەی فێرکردن:

ئەم جۆرەیان چونکە سۆزو ئەندێشەی بێ هێزەو داڕشتنەکەی هیچی وانییـە، لەبـەر ئـەوە بـە تـەواوی ناکەوێتـە بـەر واتـای هـۆنراو، هـەر بـۆ مەبەسـتی فێرکـردن بــەکاردێت، وەکــو ئــەم هــۆنراوەی (بێکەس ١٩٠٥-١٩٤٨):

شـــتێکی بـــێ خـــوێنو گیـــان
ئـــەفڕێتو ئەچـــێتە ئاسمـــان

هەڵـــدەگریٚ گـــەلێ ئینـــسان
دوو بـــاڵی پیٚومیـــە جـــوان
ناویـــان نـــاوە تـــەیارە
زۆر مەحکـــــەمو بـــــەکارە
لـــە شـــەڕا مـــسیبەتە
لـــە ئاشـــتیدا نیعمەتـــە
لـــە سـایەی حیرفـــەتو فـــەن
شـــتی وا دروســـت ئەکـــەن

**یا ئەم هۆنراوەیەی (ئەحمەد خانی)[1].**

(نار)ە ئاگر (حر)ە گەرمی (برد)ە ساردی
(ثلج) بەرفە (ماء)و (سلسل) هەردوو ئاڤ
(رجل) پیٚو (رکبة) ئەژنۆ (بطن)ە زك
(صدر) سنگە (جید)ە ئەستۆ (عین)ە چاڤ
(فخذ) ڕانە (ضرس) ددانە (شفة) لیٚڤ
(ظهر) پشتە (سرة) ناڤك (جوف)ە ناڤ
(کبد) جەرگە (کلیة) گورچك (کدنة) بەز
ڕوڤینە (امعاء) و (مرارة) هەم زەراڤ

((قوتابیان یەك لەم دوو نموونەیە لەبەر دەکەن))

---

(١) نۆ بەهارا بچوکان یا ئەحمەدیٚ خانی، تویژاندنا حمدی عبدالمجید– بەغدا ١٩٩٠.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| مەبەست | : | ڕامان |
| مێشك | : | مەژی |
| خۆی دەنوێنێت | : | خۆ نیشا ددەت |
| سروشت | : | خۆڕست |
| شایانی | : | هەژی |

## مەبەستەکانی هۆنراوەی کوردیش ئەمانەن:

### ١. نیشتمانپەروەری و نەتەوەیی (یان سیاسی):

یەکێکە لە گرنگترین مەبەستێن هۆزان و هۆنراوەی کوردی، ئەم جۆرەیان لەگەڵ سەر هەڵدانی هەستی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری پەیدا بوو، ڕابەری ئەم مەبەستە ئەحمەدی خانی (١٦٥٠- ١٧٠٦ز)و ئینجا حاجی قادری کۆیی (١٨١٧-١٨٩٧ز)و ئەوانی ترن. ئەم جۆرە هۆنراوانە سۆزێکی نەتەوە پەروەری و نیشتمانپەروەریی دەخەنە دڵ و دەروونی خوێنەرەوە، ئەمەش نموونەیەکە لەو مەبەستە:

**خانی لە پێشەکی مەم و زیندا دەڵێت:**

قەت مومکنە ئەڤ ژ چەرخی لەو لەب

تالیع ب بتن ژ بۆ مە کەوکەب؟

بەختێ مە ژ بۆ مەڕا ببت یار

جارەك ب بتن ژ خابی هشیار

رابـــت ژ مـــەژی جهـــان پەناهـــەك
پەیـــدا ب بـــتن مـــە پادشـــا هـــەك
ئیـــدی هونـــەرا مـــە بێتـــە دانـــین
قـــەدری قەلـــەما مـــە بێتـــە زانـــین

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## ڕاڤە کردنی پەیڤان

ژ خابی هوشیار : لە خەو هۆشیار بیتەوە
ژ بۆ مەرا : بۆ ئێمە
رابت ژ مە ژی : لە ئێمەش یا لەناو ئێمەش سەرهەڵدات.

### ٢. دڵداری و ئەڤینی:

کە یەکێکە لە مەبەستە هەرە بڵندو جوانەکانی هۆنراوەی کوردیو لوتکەی هەستی مرۆڤ پیشان دەدات بەرامبەر بە خۆشەویستەکەی نموونەشی ئەم هۆنراوەی (تایەر بەگی جافە ١٨٧٥– ١٩١٨ز):

تـا بەکـەی قوربـان بنـاڵم مـن بـە ئـێش‌و دەردەوە
دەس بە ئەژنۆ قوڕ بەسەر دایم بە ڕەنگی زەردەوە
ڕۆژی ئـەوەل بـوو کـەزانیم مـن ئـەبێ دێوانـە بم
عاشقی تـۆ نـەوعی مـەجنوون وا بـەکێوو هـەردەوە

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

### ٣. شانازی کردن و دلێریی:

ئەم مەبەستەش تایبەتە بە کاروباری شەڕو شۆڕەوە، وشەکانی دەبێ لەگەڵ سروشتی هۆنراوەکە بگونجێن، هەر وەك لەم هۆنراوەی حاجی قادری کۆیی (١٨١٧- ١٨٩٧ز) دەردەکەوێ:

**لە گاوان‌و شوانی کوردەکان یەك**
**بەسە، بۆ لەشکری سەد کەڕەلەك**
**فیدای گاوان‌و شوانتان حاتەمی تەی**
**بە قوربانی سەپانتان ئالی بەرمەك**
**مریشکی ئێوە صەییادی شەهێنە**
**لەکن عەنقا فرووجە حاجی لەقلەق**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

### ٤. لاوانەوە:

تایبەتە بە باسکردنی مردن‌و جۆری مردن‌و پیشاندنی دڵتەنگی، وشەکانیشی دەبێ لەگەڵ مەبەستی هۆنراوەکە بگونجێن.

پیرەمێرد (١٨٦٧- ١٩٥٠ز) لە لاوانەوەی (مستەفا خۆشناو)و (محمد قودسی) کە دووان بوون لە چوار ئەفسەرە شەهیدەکەی ساڵی (١٩٤٧ز)دا دەڵێ:

**دیسان وا کۆستی نوێمان کەوتەوە**
**گەڕی گەردوونە کوردی گرتەوە**
**ئەم دوو دار تەرمە دوو نەڕە شێرە**

زنجیریـــان پـــچڕان گەینـــەوە ئێـــرە

لـــەڕێی ئێمـــەدا گیانیـــان فیـــداکرد

نـــاوی بڵنـــدیان وا بۆیـــان بـــرد

ئـەو پەتـەی لـە ملـی ئەمانـە خـرا

ئـەوانی خنکـان بـەڵام پـەت پـچڕا

**یان ( ئەحمەدی نالبەند ) بە بۆنەی کۆچی دوایی کوڕەکەی دەڵێت :**

مـن هـەبوو ژملکـێ دنـێ ئـەو کـوڕ تنـێ

مـن ڤیـا بـوو بـۆ کـەلامو خواندنـێ

دێ چ لێ کـــەم پاشـــی وی مـــالێ دنـــێ

شـبهێ سـەرا دێ مـە مـێلاك مایـە کـون

ئـەو هونـەر نینـە نهـۆ ئـەز باخڤم

ڕۆژو شـەڤ چـەندن دوو لـەحزا نـانقم

شـبهێ ئاڤـا لبـەر کـەلێ دی لڤلڤـم

ئـــاگرێ دەردێ دلی بەربوویـــە مـــن

(قوتابیان یان هۆنراوەکەی پیرەمێرد، یان ئەوەکەی ئەحمەدی نالبەند لەبەر دەکەن).

## ڕاڤەکردنێ پەیڤان

| | |
|---|---|
| ژ ملکێ دنێ | : لە مولکی دونیا |
| ئەو کورتنێ | : ئەو کورە بە تەنیا |
| من ڤیابوو | : ویستبووم |
| مالێ دنێ | : ماڵی دونیا |
| مێلاك | : جەرگ، جگەر |
| نانڤم | نانووم، ناخەوم |
| لەبەر کەلێ | لەبەر کوڵانێ |
| لڤلڤم | دەجولێمو بێ حەجمینم |

### ٥. داشۆرین و پێدا هەڵگۆتن:

دوو مەبەستی دژ بە یەکن، یەکەمیان بۆ نزمکردنەوەو دەرخستنی لایەنی کەمو کورتییە، دووەمیشیان بۆ ڕێز لێ گرتنو خۆشەویستییە نموونەی هۆنراوەی داشۆرین ئەم پارچەیەی شێخ ڕەزای تاڵەبانییە.

**هەزار ئەفسونو جادووی پیوە ئاوێزانە ئەم ڕیشە**

**عیلاجی گەر ببێ یا گوزمیا گوێزانە ئەم ڕیشە**

**بە تەحریکی تەلێکی سەد هەزار نەفسی بە کوشتن دا**

**ڕەئیسی حیلەکاران، شای قومار بازانە ئەم ڕیشە.**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## ٦. وەسف:

مەبەست پێی وەسف کردنی سروشتو مرۆڤ و شتی جوانە، لەم لایەوە دەتوانین بڵێین هۆنراوە هەر هەمووی وەسفە، بەڵام لە هۆنراوەی کوردیدا بەم مەبەستە زیاتر بە لای وەسفکردنی سروشتی جوانی کوردستاندا دەشکێتەوە، بۆ نموونە (مەولەوی ١٨٠٦– ١٨٨٢) لە وەسفی بەهاردا دەڵێ:

**نازك تەدارەك فەسلی وەهاران**

**زەریف ئارایش[١] هەردەو کۆهساران**

**گوڵ چون[٢] ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان**

**وەفراوان[٣] چون سەیل دیدەی[٤] من جۆشان**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

---

(١) زەریف ئارایش: جوان ڕازاوەتەوە.

(٢) چون: وەکو.

(٣)وەفراوان: بەفراوان.

(٤) دیدەی من: چاوی من.

### ٧. مەینۆشی:

مەبەستێکی کەم بایەخە لە هۆنراوەی کوردی، وشەکانی بەزۆری لە دەوروپشتی کۆڕی مەیو گەڕە لاوژەی خۆشیدا دەسورێتەوە نموونەی ئەم مەبەستەش ئەم هۆنراوەی (بێکەس)ە.

**ساقی ئۆباڵی منت بە ئەستۆ**
**دنیایە، وەسیەت ئەکەم لە لای تۆ**
**کە مردم توخوا هەر بە مەی بمشۆ**
**بۆم مەکەن شینو گریانو ڕۆ ڕۆ**
**لەجێی یاسینو تەلقینو شینم**
**بێن کۆڕێ بگرن لەژوور سەرینم**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنە)

## فۆلكلۆر چییە؟

بۆ ئەوەی باش لە باسەكەمان بگەین، دەبێت بە وردی لە فۆلكلۆرو واتای بگەین.

## وشەی فۆلكلۆر:

ئەم وشەیە، وشەیەكی لێكدراوە لە دوو وشەی (lore. folk )ی ئینگلیزییەوە هاتووە، كە یەكەمیان مانای (خەڵك) یا (گەل) دەگرێتەوەو دووەمیان مانای (چیرۆك، ژیریی، هونەر، زانست) دەگرێتەوە واتە سامان یا كەلەپووری خەڵك، بەم پێیە فۆلكلۆر بە هەموو ئەو سامانو كەلەپوورە كۆنانە دەڵێن كە بەدرێژایی مێژوو دەست كردو بەرهەمی خەڵك بوونو ماونەتەوە، وەك:

پاشماوەكانی جلو بەرگی میللی كۆنو ئێستا، ڕایەخو هۆی تێدا خواردن (قاپو، كاسەو، كەوچك) گەلێك چەشنی پیشەسازیو، نەقشو نیگارو جۆری خواردەمەنیو گەلێك شتی تر كە شەقلی تایبەتی كۆنی میللەتێك لە بەرهەمێكی دەستكرد یا بەرهەمی بیردا بهێڵێتەوە.

هەندێك جار لەناو فۆلكلۆردا بەشی بیر، یا بەشی ئەدەب جیا دەكەونەوەو پێی دەڵێن (بەرهەمی سەرزاری خەڵك) ئەو بەرهەمەش ئەوەیە كە بەسەر زارەوەیە، دەماو دەمو پشتاو پشت، كوڕ لە باوكەوە، منداڵ لە دایكەوە دەیبیستێتو دەمێنێتەوە، لەبەر ئەمە ئەدەبی فۆلكلۆر بە بەرهەمی تاقە كەسێك دانانرێت، بەڵكو دەدرێتە پاڵ هەموو میللەت، بەرهەمێكە، كە هەموو گەل خولقاندوویەتی، بەرهەمی فۆلكلۆری

شێوەیەکی سادەی وای هەیە، کە هەموو گەل تێی بگاتو شەقلی تایبەتی ئەو گەلە یا ئەو زەمانو دەورەی خۆی پێوەیە.

بەرهەمی فۆلکلۆر ئێجگار زۆر لەناو خەڵکدا بڵاوە، تا کاتی بڵاوبوونەوەی خوێندەواریو شارەزابوونی خەڵکو ڕاهێنانیان لەگەڵ ئەدەبیاتی نووسراودا، کەم کەس هەیە شتێك لە فۆلکلۆری گەلەکەی خۆی نەزانێتو لەبەری نەبێتو بە گوتنو بەگێڕانەوە دەری نەبڕێت.

ئەدەبیاتی فۆلکلۆر لەناو هەر میللەتێکدا دا چەند بەشو جۆری هەیەو ئەم بەشو جۆرانە ڕەنگە هەندێکیان لە فۆلکلۆری هەموو میللەتاندا یا لە فۆلکلۆری چەند میللەتێکدا یەك بنو ڕەنگە هەندێکیان جیابن، لەبەر ئەمە هەر میللەتە دەتوانێت چەشنەکانی بەرهەمی ئەدەبی فۆلکلۆری خۆی دەست نیشان بکات.

**دەتوانین لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا ئەم چەند بابەتە ببینین:**

١. **ئەفسانە**: بەرهەمی ئەو کاتەیە کە مرۆڤ بێ دەسەڵات بووەو ڕووبەڕووی سروشت وەستاوە، بۆیە دەکرێت بڵێین کە ئەفسانە بەرهەمی سەرەتای ژیانی مرۆڤایەتییە.

٢. **چیرۆك یا سەرگوزەشتە**: بەشێکی گەورەی ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردییە، بەرەو پێش چوونێکی ئەفسانەیە، لەڕووی ڕووخسارو داڕشتنەوە لەو دەچێت، بەڵام کەرەستەی ئەفسانە زیاتر نوقمی خەیاڵ بووە، کەچی کەرەستەی چیرۆك لەژیانەوە وەردەگیرێت.

٣. **داستان:**

٤. **گۆرانی**: له سەردەمێکی زۆر کۆنی ژیانی مرۆڤایەتییەوە پەیدابووە، لەبارەی هۆکاری پەیدابوونی ئەم جۆرە فۆلکلۆرەوە دوو بیرو باوەڕ هەن:

١. بیرو باوەڕی یەکەم هۆکارەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئیشی هەرەوەزیو بە کۆمەڵی مرۆڤ.

٢. ئەوی دووەمیشیان، دەیگەڕێنێتەوە بۆ لایەنی ئایینیو دەڵێت گۆرانی ئایینی کۆنترین جۆری گۆرانییە.

لە گۆرانی ئیشکردنیشدا وشەو ئاوازو دەنگ لەگەڵ بزووتنەوەی ئەندامەکانی لەشدا تێکەڵ دەبنو چاکترین نموونەش گۆرانی دروێنە کردنە.

٥. **پەندی پێشینانو قسەی نەستەق:**

٦. **گاڵتەو گەپ**: هەمیشە لەشێوەی چیرۆکێکی کورتدا دادەڕێژرێت، مەرج نییە قارەمانەکانی ئەم چیرۆکانە مرۆڤ بن، زۆرجار لەسەر زمانی (ئاژەڵو باڵندە) شەوە دەیگێڕنەوە. قارەمانی گاڵتەو گەپ، کەسێکی ڕاستەقینەی قسە خۆشو نوکتە بێژە، نموونەی ئەم جۆرە ئەدەبە فۆلکلۆرییەش چیرۆکەکانی (مەلای مەشهوورن).

٧. **مەتەڵ**: مەتەڵ زیاتر بۆ کات بەسەربردن بەکاردێت، بەرهەمی سەرزاری خەڵکە، بەشێوەیەکی نادیارو تەماوی دەردەخرێت، مەبەستەکەشی پێویستی بە ڕامانو بیرکردنەوە هەیە.

٨. **یاری: پێناسە**

ئەم بابەتەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی تێکڕا بەسەر چاوەو بناغەی ئەدەبیاتی نووسراوە، دادەنرێتو تا ئەمڕۆش کار دەکەنە سەر ئەو ئەدەبیاتەوە، نووسەرو شاعیری ئەم سەردەمە لەزۆر ڕووەوە سوودی تەواو لەم بابەتانەو لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆر دەبینین، بەڵام یەکێك لەم بابەتانە، تەواو گۆڕینی بەسەردا دێتو چەشنە فۆلکلۆرییەکەی شێوەی ئەدەبیاتی نووسراو وەردەگرێتو قاڵبێکی ئەو تۆی هەیە کە دیمەنەکانی ئەدەبیاتی کوردیی ببەستێت بە ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵاتو ئەدەبیاتی جیهانەوە، ئەم بابەتەش داستانە.

**داستان:** بەرهەمێکە لە چیرۆك دەچێت، سەرگوزەشتەیەکی ڕووداو یا ڕاستەقینە دەگێڕیتەوە کە بەژیانەوە بەستراوە، ڕاستی ژیان لە دەروونی خاوەن بەرهەمەکەوە دەهێنێتەوە دەرەوە، چیرۆکەکەش کارو کردەوەی پاڵەوانان دەگێڕێتەوەو زۆر جاریش باس لە شەڕو شۆڕو جەنگ دەکات، گەشەسەندنی مێژووی داستان بەستراوە بە گەشەسەندنی مێژووی گەلەوە.

## دیارترین لایەنە جیاکەرەوەکانی داستان ئەمانەن:

١. چیرۆکی داستان گەلێك ڕووداوی ترسناكو سامناکی وای تێدایە کە بەزۆری لە پاڵەوانێکی ناودار دەدوێت.

٢. زمانی چیرۆکەکە، پتەوو بەهێزو شێواز جوانە، بە زۆریش هۆنراوەی داستان یەك کێشی هەیەو لێی دەرناچێت.

٣. بەشی زۆری ڕووداوو بەسەر هاتەکانی ناو داستان، دەگمەن‌و نا ئاسایین، کەسانی ناو داستانیش پاڵەوانی مەزن‌و بناڤ و دەنگن، جاری وا دەبێت هەندێك لە خواوەندەکان دەبن بە پاڵەوان بۆ داستانەکان.

## جۆرەکانی داستان:

### ئەو داستانە جیهانییانەی لەبەر دەستمانن، دەکرێن بە دوو جۆر:

**یەکەمیان**: ئەوانەن کە کاتی دانانیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر کۆن‌و شتێکی وا لەبابەت سەردەمەکانیانەوە نازانین، ئەم جۆرە پشتاو پشت‌و سەردەم دوای سەردەم ماونەتەوە، بە ماوەیەکی زۆر پاش دانانیان ئینجا نووسراون، لەوانەشە دانانی ئەو جۆرەیان چەند سەدەیەکی خایاندبێت، بەزۆریش پاڵەوانەکان لەم داستانانەدا خواوەندەکانن، چونکە لەو سەردەمانەدا خەڵك باوەڕی بە چەند خواوەندێك بووە، کە بیرو هزرو ئارەزووی مرۆڤانەیان هەبووە، هەروەها ئەمانە کۆنترین جۆری هۆنراوەی مرۆڤایەتین.

**دووەمیان**: ئەوانەن کە لەم سەردەمانەی دواییدا کەسانێکی شاعیر دایان ناون‌و هەر هەموویان لە دانانیاندا لە ڕووی کێش‌و شێوازو بۆ چوونەکانیان لاسایی داستانە کۆنەکانیان کردووەتەوە، بەڵام سەرەڕای توانایی‌و لێهاتووییان نەگەیشتوونەتە ئاستی داستانە میللییە کۆنەکان.

## مێژووی داستان لە جیهان:

ئەگەر لەمێژووی داستانی جیهانی بدوێین پێویستە لە کۆنترین داستانەوە دەست پێ بکەین کە تا ئێستا بەدەستمان گەیشتووە، ئینجا وردە وردە بە مێژوودا هەڵگەڕێین تا دەگەینە سەردەمە تازەکانو بەم جۆرە:

### ١. داستانی سۆمەری:

سۆمەرییەکان لە سێ هەزار ساڵەی پێش زایین بەولاوە لە خوارووی عێراقدا ژیاونو خودانی شارستانیەت بوون، لەبەر ئەوە پاشماوەی زۆریان لەدوای خۆیاندا بەجێ هیشتووە، پشکنینو گەڕان بەدوای پاشماوەکانیان بووە هۆی دۆزینەوەی گەلێك داستانی سۆمەری، شلۆڤە کردنی جۆری نووسین لای سۆمەرییەکان سەرەتایێك بوو بۆ زانینی نهێنییەکانی ئەو داستانانەو بوو بە دەستپێك بۆ لێکۆڵینەوەی مێژووی داستانی جیهانی.

داستانی سۆمەری زیاتر لەشێوەی ئەفسانە دایە، قارەمانانی بەزۆری خواوەندەکانی سۆمەر بوون وەك ئینلیلو ئانکیو ئۆتۆو دموزی، ئەوەی داستانی سۆمەری بە داستانەکانی میللەتانی دوای خۆیان دەبەستێتەوە، ئەوەیە کە لە مانیشدا سەر گوزەشتە دهێتە ڤەگێڕانو بەحسێ قارەمانیەتیێو ئازایەتیێو لە خۆ بووردنێ دهێتە کردن، ئەڤەژی ل داستانا (گەلگامیش) دیارو خویانە.

داستانی گەلگامیش یەکە لە بەناوبانگترین داستانێن سۆمەری، لەودا گەلگامیش بەدوای (نەمریی)دا دەگەڕێت کە یەکێکە لە سیفەتە

بنەڕەتییەکانی خواوەندەکان، بەڵام ئەوەی ئەڤ داستانە لەداستانەکانی تری سۆمەریان جودا دەکاتەوە ئەوەیە کە پاڵەوانی داستانەکە خواوەندێکی تەواو نەبووە، هەر لەبەر ئەوەشە بەدوای نەمرییەدا گەڕاوە کە خواوەندەکان هەیان بووەو گەلێك قارەمانیەتیو ئازایەتی لەپێناو ئەم مەبەستەدا نواندووە، بەڵام بە ئاکام نەگەییوە، ئانکو نەگەهشتیتە مەبەستا خۆ.

## ٢. داستانی یۆنانی:

کۆنترین نموونەی داستانی یۆنانییان، ئەلیادەو ئۆدیسای هۆمیرۆسن، کە کۆنترین جۆری هۆنراوەن کە تا ئێستا گەیشتبێتە دەستمان.

ئەلیادە باس لەیەك لە ڕووداوەکانی ئەو جەنگە خوێناوییە دەکات کە لە بەینی ئەگریكو تەڕوادەدا ڕووی داوە، جەنگەکە (دە) ساڵی خایاند، بەڵام ئەلیادە باس لە هەندێك لەڕووداوەکانی ساڵی یەکەم دەکات.

بە قسەی (بیری Bury) مێژوو نووس ڕووداوەکان دەبێت لە ١٩٩٠ پێش زایین ڕوویان دابێت، تەروادەو یۆنان هەر لەکۆنەوە دژومنایەتیو دوو بەرەکییان هەبووە، وا ڕێك کەوت کە پادشای تەڕوادە، (هێلانە)ی ژنی پاشای ئەسپارتەی فڕاندو ئەویش هانای بردە بەر یۆنانییەکان، تەڕوادەییەکانیش داوای یارمەتییان لە میرەکانی ئاسیای بچووك کرد، لەبەر ئەوە ماوەی دە ساڵ جەنگێکی خوێناوی لەنێوانیاندا ڕووی داو ئەنجامەکەشی خۆ بەدەستەوە دانی تەروادە بوو، پاڵەوانانی ئەم

داستانە هەموویان مرۆڤی ئاسایی نەبوون، هەندێکیان نیمچە خواوەند بوونو ئەوانی تر خواوەندی ڕاستەقینە.

داستانی دووەمی هۆمیرۆس، کە (ئۆدیسا)بوو، باس لە بەسەرهاتی یەك لە پالەوانێن ئەگریکییان دەکات کە ناوی (ئۆدیسیۆس) بوو، پاش خۆ بەدەستەوە دانی تەڕوادە، ئەڤ پاڵەوانە ڕێز لە دڵسۆزیو میهرەبانی (بنۆلۆپیا)ی خێزانی دەنێت، کە چۆن پاش چەندساڵی بێ سەرو شوێن بوونی ئودیسیۆسی مێردی هەر لەسەر دڵسۆزی خۆی مایەوە تا هاتنەوەی مێردەکەی.

**دوو بەرهەمەکە لە سەدەکانی نۆیەمو هەشتەمی پێش زایین نووسراون.**

### ٣. داستانی هیندی:

هیندستان، وڵاتی ئەفسانەو داستانە، بۆیێ لە ڕێڕەوی مێژووی داستانی جیهاندا، ئەم وڵاتە ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە، لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین لەو وڵاتەدا دوو داستان دهێنە دیتن، (مەهابەهاراتا) و (ڕامایانا). ئەم دوو داستانە چونکە لەکاتێکی درەنگدا پەیدا بوون، بۆیێ شەقڵی تاکە کەسییان پێوە دیارە.

داستانی (مەها بەهاراتا) کە لەلایەن (ویاس) ناوێك دانراوە، باس لەو جەنگە درێژخایەنە دەکات کە لەنێوان خواوەندەکانو تایەفەی (ئاسۆرا)دا ڕوویدا، هەر لایەنێکیش سەرکردەو پێشەوای خۆی هەبووە، سەرکردەی ئاسۆرا کە ناوی (سۆکەر ئەچاریا) بوو، توانای

زیندووکردنەوەی کوژراوانی جەنگی هەبوو، بۆیێ خواوەندەکان زۆری لێ دەترسانو هەوڵی ئەوەیان دەدا کە بیکەن بە دۆستی خۆیان، داستانەکە پڕە لە باسی شەڕو شۆڕو پیلان گێڕان، هەر لەو داستانەداو لە زمانی (ویاس) هەندێك پەندو ئامۆژگاری دەگێڕنەوە وەك (هەر کەسێك بەرامبەر بە دوژمنکارییو دەست درێژی دراوسێکەی، دان بەخۆیدا بگرێتو لێی خۆش بێت، ئەوا هەموو خەڵکی ئەم دنیایە دەکاتە بەندەو کۆیلەی خۆی).

## ٤. داستانی ئەنیادە:

داستانێکە لە دانانی (ڤێر جیل)ی شاعیری بەرزی ڕۆمانییە، سەردەمی دانانی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یەکەمی پێش زایین، باس لە (ئینیاس)ی پاڵەوانی تەڕوادە دەکات، کە چۆن لەگەڵ ئەگریکەکان کەوتووەتە جەنگو دوای خۆ بە دەستەوەدانی تەڕوادە باوکە پیرەکەی لە کۆڵێ دەکاتو شارانو وڵاتانی پێ دەکا تا بارو بارخانەی لە ئیتاڵیادا دەخاتو گوایە (دۆمۆلۆس)ی دامەزرێنەری شاری ڕۆما نەوەی وی بووە.

## ٥. داستانی شانامە:

شانامە شاکاری شاعیری بەناوبانگی ئێران فردەوسی بوو، دانانی داستانەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەیەمی زایینی، داستانەکە شەست هەزار دێرە هۆنراوە، باس لە مێژووی کۆنی ئێران دەکات تا سەردەمی ئیسلامەتی لە سەدەی حەفتەمی زاییندا، ئەم داستانە بە گەورەترین

سەرچاوەی زمانی فارسی دهێتە دانان، باس لەو جەنگو شەڕو شۆڕانە دەکات کە ئێرانیانی کۆن لە سەردەمی ساسانیو غەزنەوییەکاندا لەگەڵ دوژمنەکانی خۆیاندا بەرپایان کردووە تا هاتنی ئایینی ئیسلام، کە تیایدا بە گیانێکی نیشتمانپەروەریو نەتەوە خوازییەوە قارەمانیەتیو ئازایەتی جەنگاوەرانی ئێران دەگێڕێتەوە وەك ڕۆستەمی زاڵو سوهرابو زۆرانی تر، ئەم داستانە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ زانینی مێژووی کۆنی ئێران.

جگە لەو داستانە بناڤ و دەنگانەی باسمان کردن، ژمارەیەك داستانی تازەتر هەن کە دەگەڕێنەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست وەك داستانی (سروودی تاریکی) کە داستانێکی کۆنی ئەڵمانییەو باس لەکارو کردەوەی هۆزە ئەڵمانییەکان دەکا لەسەردەمی کۆندا، هۆنراوەکانی ئەم داستانە لەسەدەی دوازدەمی زاییندا کۆکرانەوە، هەروەها داستانی (کۆمیدیای پیرۆز)ی دانتی، شاعیری گەورەی ئیتالیا لە سەدەی چوارەمی زایین کە یەکێکە لە شاکارە ئەدەبییەکانی سەدەی ناوەڕاست.

داستان دیاردەیەکی مێژووییە، لەبەر ئەوە لای هەموو میللەتان وەك یەك پەرە ناسێنێت، بەڵکو لە گەشەکردنو پەرەسەندنیاندا جیاوازی هەیە، هەر ئەمەش وا دەکات کە لە داستانی کوردیدا هەندێك دیمەن هەبن کە لەگەڵ داستانی میللەتانی تردا یەکی بخات، هەروەها هەندێك دیمەنی تری تێدا بێت کە لەو داستانانەی جیا بکاتەوە.

## داستانی ڕۆژهەڵات:

لەناو میللەتانی ڕۆژهەڵاتدا گەلێك داستانی هاوبەش هەن، ئەو داستانانە هاوبەشن چونکە:

١. بە چەند زمانێکی ڕۆژهەڵاتی هەن.

٢. لەناو چەند میللەتێکداو بەشێوەی جیاواز دێنە گێڕانەوە.

٣. هیچ یەك لە میللەتانی ڕۆژهەڵات ناتوانن بیانکەن بە مولکی تایبەتی خۆیان، با ڕووداوەکانی ناو داستانەکەش لە وڵاتی ئەو میللەتەدا ڕوویان دابێتو ناوی قارەمانەکانیشی سەر بەو میللەتە بن.

٤. لەناو هەر میللەتێکی ڕۆژهەڵاتدا، داستانەکە، کە دەگێڕنەوە مۆرکو شەقڵی ئەو میللەتەی پێوە دەبێت.

بۆ نموونە داستانی (لەیلو مەجنوون)، شوێنەوارو ناوی سەر بەخاکو زمانی عەرەبن، بناغەکەشی هەر ئەو چیرۆکە فۆلکلۆرییە عەرەبییەیە کە لەناو عەرەبدا لەبارەی خۆشەویستی (لەیلا)و (قەیس)ەوە دەیگێڕنەوە، بەڵام ئەم داستانە لەناو کوردو فارسو ئازەرو گەلێك میللەتی دی ڕۆژهەڵاتی باوەو بە جۆری جیا جیا دەیگێڕنەوە.

هەروەها داستانی (شیرینو فەرهاد) یا (شیرینو خەسرەو)، شوێنەوارەکەی لە کێوی (بێستوون)ی خاکی کوردستانی ئێرانە، ناوی قارەمانەکانی کوردییە، بەڵام لە پاڵ کوردیدا، بە فارسیو بە تورکیو بە چەند زمانێکی تریش دهێتە ڤەگێڕان (گێرانەوە).

هەر بەم جۆرەش، چیرۆکەکانی ناو داستانی (شانامەی فیردەوسی)و باسی قارەمانەکانی ئەو چیرۆکەش، بەر لە دارشتنەوەکەی فیردەوسی

لەناو میللەتانی ڕۆژهەڵاتدا بڵاوبوون، ئەوەندە هەیە فیردەوسی سەر لە نویٚ لەشێوەی داستانی هۆنراوەدا دای ڕشتوەتەوەو گیانێکی فارسی پیٚ بەخشیوە.

## لە فۆلکلۆرەوە بۆ نووسین:

زانیمان کو پشکا هەرە زۆری داستانێن ڕۆژهەلاتی، ئەون کو ژ سەرەتا لناڤ خەڵکیدا بلاڤ بوونو بەشەك بوون ل ئەدەبیاتیٚ فۆلکلۆری تا لە سەدەو سەردەمێکدا، شاعیرەك دهێتو ئەڤ داستانە فۆلکلۆرییە دەخاتە قالبی ئەدەبیاتی نوسراو. لەوانەشە شاعیر گەلێك بیرو گیانی سەدەو سەردەمی خۆی لەناو دارشتنە تازەکەدا دەربرێت، هەندێك لەم داستانانە بە یەك زمان، چەند جار، بەلاّم لە سەدەی جیادا، نووسراون، نووسینەوەی هەر جارێك، شەقلو مۆرکو دیمەنی سەدە تازەکەی پێوەیە بەلاّم هەر لەقالبی داستانە کۆنەکە، شاعیری تازەش، تازەگەرییەکەی لەوە دایە کە هەندێك ڕوخسارو قالبی کۆن بۆ دەربڕینی بیرو گیانی نویٚ بگونجێنێت. ئەڤ ڕاستییە ژی بناڤ ئینانا، هەندەك داستانێن ڕۆژهەلاتی دە خویاو ئاشکرا دبیت، بەتایبەتی داستانا (لەیلو مەجنون، شیرینو فەرهاد یان شیرنو خەسرەو و شێخی سەنعان) کۆ بڤی ڕەنگینە:

١. داستانی لەیلو مەجنون ب زمانێن فارسیو تورکیو کوردیو عەرەبی چەند جارەکو ژ لاییٚ چەند شاعیرەکی سەر بە چەند سەدەو سەردەمەکی ڤە هاتیە نڤیساندن، نیزامی گەنجەوی بە

فارسی، فزولی بەغدادی بە تورکی، حارسی بەتلیسی بە کوردیو ئەحمەد شەوقی بە عەرەبی.

٢. داستانا (شیرینو فەرهاد یان شیرینو خەسرەو) ژی، بە چەند زمانێكو چەند جارێكو لەلایەن چەند شاعیرێکەوە، لە چەند سەدەو سەردەمێکی جیاوازدا نووسراوەتەوە، نیزامی گەنجەوی بە فارسی، ئەمیر خەسرەوی دەلهەویو خانای قوبادی بە کوردی، نازم حیکمەتیش لە سەدەی بیستەمدا بە تورکی.

ژ بلی هاوبەشیەتی لە داستاندا، وەرگێرانیش هەیە، کە بریتییە لەوەی کە ئەو داستانەی بە یەکێك لە زمانەکانی ڕۆژهەڵات نوسراوەتەوە، شاعیرانی میللەتانی تری ڕۆژهەڵات، داستانە نووسراوەکە وەکو خۆی وەردەگێڕنە سەر زمانی خۆیانو بەم جۆرە داستانەکە وای لێ دێت کە بە چەند زمانێك بهێتە گێڕانەوە، مۆركو شەقڵی ئەو میللەتە وەرناگرێت کە وەریان گێڕاوەتە سەر زمانەکەی. ئەگەر داستانی ڕۆژهەڵات لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆریدا شێوەی شیعرو بابەتی داستان یا (بەیت)ی کۆنیان بوو بێتو دوایی بووبن بە داستانی نوسراو، ئەوا لەم سەدەیەدا هەموویان دەست دەدەن بۆ ئەوەی ببنە کەرەسەی نووسینی ڕۆمانو پیەسو سیناریۆی تازەی سینەما، هەندێکیشیان لە قالبی ئۆپێرا یان بالێدا گەیشتنە سەر شانۆ گەورەکانی جیهان.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| ↓ | | ↑ |
|---|---|---|
| لە چیرۆك دەچێت | : | ب سەر چیرۆکێڤە دچێت: وەك چیرۆکێیە. |
| دەگێڕێتەوە | : | ڤەدگێڕیت. |
| بەستراوە | : | گرێدایە |
| ترسناکو سامناك | : | ب ترس‌و سەهم |
| جۆر | : | چین |
| بدوێین | : | بئاخڤین |
| بەش | : | پشك: باهر |
| دەگمەن | : | هەمما: گەلەك کێم. |
| ڕاستەقینە | : | دروست، ژ ڕاستا. |
| نیمچە | : | نیڤ |
| درێژخایەن | : | زۆر ڤەکێش |
| جگە | : | بێجگە، ژبلی |

## داستانی کوردی:

وەك گوتمان گەلێك داستان هەن بەشی هەموو گەلانی ڕۆژهەڵاتیان پێوەیە، بەڵام گەلێك داستان هەن کە تایبەتیی میللەتێکنو زۆرجار هەیە کە داستانێك لە تاقانە ناوچەیەکی وڵاتێکدا بڵاو دەبێتەوەو بە تاقانە لەهجەیەکی ئەو زمانە هەیە. بەڵام هەندێك داستان هەن، لەناو هەموو ئەم میللەتەدا بڵاونو بە چەند لەهجەیەکی ئەو زمانەو بە چەند چەشن یا بە یەك چەشن دەگێڕرێتەوەو پشتاو پشت دەمێنێتەوە، تا لە سەدەیەکدا دەخرێتە قاڵبی ئەدەبیاتی نووسراوەوەو ئەو نووسینەی داستانەکە بەزمانی ئەدەبیی میللەتەکە ئەو داستانە دەکات بە بەشی هەموو گەل.

ئەگەر لەداستانی ڕۆژهەڵاتەوە بێینە سەر داستانی کوردی، دەبینین گەلێك داستانی هاوبەشمان لەگەڵ میللەتانی ڕۆژهەڵاتدا هەیەو گەلێك داستانیشمان هەیە، کە بەشی کورد نەبێت، بەشی میللەتی تری پێوە نییە. واتە ئەگەر داستانەکە لەسەرەتادا ڕاستەقینەو ڕووداو بێت، ئەوا لە کوردستاندا ڕووی داوەو قارەمانانی کوردنو هەر بە زمانی کوردیش دەگێڕرێتەوە یا نوسراوەو لەناو کورددا بڵاوە، نموونەی ئەمانە داستانی (مەمی ئالان یا مەمو زین، خەجو سیامەند، خانزادو لەشکری، دوانزە سوارەی مەریوانو گەنج خەلیل)و گەلێك داستانی تر...

## بەشەکانی داستانی کوردی:

لێرەدا وشەی (داستان) بە مانایەکی فراوان بەکار دەهێنین، ڕەنگە لە پلەیەکی تری خوێندندا ئەم مانایە بگۆڕێتو هەر چەشنە داستانە ناوێکی لێ بنرێت. لە کوردیدا لە پاڵ وشەی (داستان)دا، وشەی (بەیتو چریکەو لاوك) بەم مانایەی ئێستای بەکار دەهێنرێن.

بەم جۆرە دەتوانین داستانی کوردی (بەتایبەتی داستانی فۆلکلۆری) بکەین بە دوو بەشەوە:

١. **داستانی قارەمانێتی.**
٢. **داستانی دڵداری.**

### ١. داستانی قارەمانێتی:

قارەمانیو ئازایی دوو وشەی خۆشەویستن لەناو کورددا، ڕەنگە هەر ژیانی پڕ لە ئازارو ناخۆشیو بەربەرەکانیو خەباتی چەندین سەدەی مێژووی کۆنو تازە وای لە کورد کردبێت کە حەز بە ئازایی بکات، نرخ بە پیاوی مەردو لە خۆبردوو بدات، قارەمان جێگەیەکی بڵندی هەبێت لای ئەو. کە مردن هاتو خۆ لێ پاراستنی نەبوو، مرۆڤ دەبێت بە ئازایی بمرێت، ئەم ڕاستییەی چەندین سەدە هەزاران جار هاتۆتەوە بەردەمی گەلێك ڕۆڵەی ئەو میللەتەو بەردەمی ئەو خەڵکەو وای کردووە کە ئەم ئازاییو لە خۆ بوردنە بێت بە بەشێك لە ژیانو لە خووڕەوشتی کورد، خۆ کە ئاوڕیشی داوەتەوەو چیای سەرکەشی لە پشت خۆیەوە بە پشتو پەنا دیوە، ترسی لە هیچ هێزێکی ترسێنەر نەماوە.

ئەم ڕاستییە کە زۆرجار دووبارە بۆوە وەك گوتمان دەبێت بە بەشێك لەژیانو خووڕەوشت، بە یەکێك لە خاسیەتەکانی گەل، هەر لەبەر ئەوەش کە ئەدەبیات (چ فۆلکلۆر بێتو چ نووسراوە) ئاوێنەیەکی خاسیەتەکانی گەلن، لەبەر ئەوە تەواو ئەم ئازایی‌و قارەمانییە لە هەردوو ئەدەبیاتەکەدا (بەتایبەتی لە فۆلکلۆردا) ڕەنگی داوەتەوەو ئەو شێوەیەی گرتووە کە لێرەدا ناوی دەنێین (داستان)و لە پلەیەکی بەرەو ژووری خوێندندا دابەشی دەکەین بەسەر ئەو چەشنانەی داستاندا کە لە ئەدەبیاتی گەلانی تردا هەنو لە هەر داستانێکی کوردیدا هەندێك دیمەنی یەکێك لەو چەشنانە دەبینین.

بەم جۆرە لەهەر ناوچەیەك چەند (لاوکو بەیت)ێك دێتە بەر گوێت، کە ناوی چەند پیاوی ئازاو بە مەردیی مردوو شەهید، دەبنە سەر ناو بۆی، بێجگە لەو هەموو داستانە کۆنانەی دەربارەی قارەمانانی خەیاڵی وەك (ڕۆستەمی زاڵو زۆرابو گیوو فەلامورز... هتد) لەناو کورددا بلاون، ناوی گەلێك قارەمانو شەهیدی ئەم چەند سەدەیەی دوایی سەر ناوی (لاوك)ی ئەم دواییەن.

(سوارۆ)و (خانزاد)و (شەریف هەمەوەند)و (عەزیزو تەکش) دەچنە پاڵ (گەنج خەلیل)و (حاجی سادقی برۆ)و (ئەمینی پەریخان)و (خەلیل خۆشەوی)و (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند). لەلاوکی ئەم سەدەیەدا ناوی (شێخ سەعیدی پیران) و (شێخ مەحمود)و (قازی) دەدرەوشێتەوە.

هەر وەك دیمەنی قارەمانو ئازایی تاقە كەسێك لە داستانی كوردیدا دیارەو ئەو كەسانە كوڕی میللەتنو وێنەی پیاوی نەبەردی ئەو نەتەوەن.

هەروەها گەلێك داستان هەن، ئازایی‌و بە جەرگی‌و قوربانی دانی بە كۆمەڵی خەڵك پیشان دەدەن، لە گەلێك داستاندا میللەت خۆی دیارەو تەواوی ئەم ڕاستییە ئەوەت بۆ دەردەخات، كە گەل خۆی مێژووی خۆی دەنووسێتو خۆی مێژووی سەركەوتن نەخشە دەكێشێت.

بەربەرەكانی خەڵكی كوردستان تێكڕاو ناوچەی بابان بە تایبەتی بەرامبەر بە عوسمانییەكان، لەهەندێك داستاندا دیارە، لە داستانی (قەڵای دمدم)دا هەر چەندە (خانی لەپ زێڕین) بووە بە قارەمانی ئەو داستانە، بەڵام بەربەرەكانیی هەموو خەڵكو هەموو جەنگاوەرانی ناو قەڵاكە بوون بەدێڕی هەڵبەستی ئەو داستانە، داستانی (دوانزە سوارەی مەریوان)یش هەروەك (قەڵای دمدم) وایە، ئەم قارەمانیانە بە زۆری لە داستانی فۆلكلۆردا دەبینین، بەڵام هەندێكیان هەر لەسەردەمی خۆیان بوون بە داستانی فۆلكلۆرو لە شیعری نووسراویشدا ڕەنگیان داوەتەوە بۆ نموونە: ئازایی كوردان لە بەربەرەكانیی عوسمانییەكاندا لە پاڵ فۆلكلۆردا لە شیعری میللی عەلی بەردەشانیدا بەتایبەتی لە بەیتی (ئەو رەحمان پاشای بەبە)دا دیارە، هەروەك ئەو بەربەرەكانییە لەزۆر هۆنراوەی (سالمی ساحێبقران)دا بەتایبەتی، لە داستانی (عەزیز بەگی بابان)دا نەخشە كێشراوە، بێجگە لەمە باسی ئازایی‌و خۆ بەخت كردن بووە بە بەشێكی گەورە لەهەموو ئەدەبیاتی كوردیدا، بەڵام هەموو ئەو بەرهەمانەی باسی ئازایی دەكەن (داستان)نین، بەڵكو لە بابەتی ئەدەبی

تریشدا، وەك هۆنراوەو چیرۆكو وتاری ئەدەبی... هتد ئازاییو قارەمانیو هەق پەرستیو نیشتمان پەروەریو خۆ بەخت كردن ڕەنگی داوەتەوە.

## نموونەیەك لە داستانی قارەمانیەتی:

داستانی وامان هەن كە قارەمانیەتی كۆمەڵو هەموو گەل پیشان دەدەن، ئەوەتا لە داستانی (سوارۆ)دا ئەم وێنەیە دیارە:

**لەشكرێك هەڵستاوە لەشكری (شام)و (شیرازان)**

**پێشی دەشتە سەر عەسكەران دوایی ڕادەوەستان**

**لەسەر چۆمی (كافورو ئارازان)**

**دەپەڕیەوە بە حوكمی كەڵەكو گەمیان**

**كیژ دەڵێ دەستی منو دامێن بێ**

**زینان بەرنە كن سەڕاجان**

**شیران بەرنە كن شییر گەران**

**تفەنگان بەرنە كن چەخماخ سازان**

## ٢. داستانی دڵداری:

شاعیری گەورەی كورد ئەحمەدی خانی لە (مەمو زین)دا وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، ئایا بۆچی (مەمو زین)ی نووسیوە، یا بۆچ ئەو داستانەی لەسەر زاری خەڵكەوە، هێنایە ناو دێڕی هەڵبەست، واتە لە

داستانی فۆلکلۆرییەوە، کردی بە شا بەرهەمی ئەدەبیاتی نووسراوی کوردی.

خانی لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا چەند هۆیەك پیشان دەدات، یەکێ لەوانە ئەوەیە کە دەڵێت:

**هەم ئەهلی نەزەر نەبێن کو کرمانج**

**عەشقی نەکرن ژ بۆ خوە ئارمانج**

**تێکدا نە دتالبن نە مەتلووب**

**ڤێکرا نە موحیبن ئەو نە مەحبووب**

**بێ بەهرەنە ئەو ژ عەشقبازی**

**فاریغ ژ حەقیقیی‌و مەجازی**

**کرمانج نە پڕ دبێ کەمالن**

**ئەمما دیە تیم‌و بێ مەجالن**

**بیلجوملە نە جاهیل‌و نەزانن**

**بەلکی د سەفیل‌و بێ خودانن[1].**

(١) واتە: هەم ئەهلی نەزەر: واتە عاشقان یا سۆفی‌و خواناسان نەبێژن کە کورد عەشقیان نەکردووە بە ئامانج بۆ خۆیان. نەڵێن ئەوان– واتە کورد– بە جارێك نە تالبی عەشقن‌و نە کەس عاشقی ئەوانە، پێکەوە نە کەسیان خۆش دەوێت‌و نە کەس خۆشی دەوێن، بێ بەهرەنە لە عەشقبازی (واتە لە خۆشەویستی‌و لە خواناسی) نە لە عەشقی ڕاستەقینە دەگەن (کە بە لای خانییەوە عەشقی خواییە) نە لە عەشقی مەجازی (کە خۆشەویستی‌و دڵداری سەر زەوییە) کورد هێندە بێ کەمال (واتە بیرو هۆش‌و بەهرەی ئەدەبی نین) بەڵکو هەتیوو، بێ کەس‌و بێ رابەرن‌و ماوەی سەرکەوتن‌و پێشکەوتنیان نەدراوە تێکڕاو بە جارێك نەخوێندەوارو نەزان نین، بەڵکو سووك کراون‌و خاوەنیان نییە.

بەڵێ، خانیی مەزن ڕاستی کردووەو گەلێك باشی کردووە، خانی لێرەدا لەوە دەچێت وەڵامی ئەو کەسانە بداتەوە، کە دوژمنی کوردن‌و بە درێژایی مێژووی خەباتی کورد دەمی پڕوپاگەندەیان، لە کورد کردۆتەوە، کوردیان بە خوێن ڕێژ پیشان داوەو وایان خستۆتە بەر چاوی خەڵك کە گەلێکی درندە بێت‌و حەز بە خوێن ڕشتن‌و پیاو کوشتن‌و ناکۆکی بکات‌و مانای یەك دڵی‌و خۆشەویستی نەزانێت.

خانی هەر وەك لە چەند دێرێکی تری "مەم‌و زین"دا ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە کورد هەمیشە لە پێناوی پاراستنی خاکی خۆیدا کوژراوەو نەچۆتە سەر خاك‌وماڵی کەس، لێرەدا ئەوەشمان پیشان دەدات، کە کورد زۆر باش مانای خۆشەویستی دەزانن‌و زۆر خۆشەویشتی‌و دڵداری قووڵ‌و زۆر چیرۆکی دڵداری لە کوردستاندا ڕووی داوە.

ئەگەر تەماشەیەکی بەرهەمی داستانی کوردیی بکەین، ڕاستیی ئەم قسەیەی خانیمان بۆ دەردەکەوێت، گۆرانیبێژی کورد لەگەڵ داستانی قارەمانیدا سەدان چیرۆکی دڵداری‌و خۆشەویستی‌و لە سۆزی دڵداری‌و لە بیری بەرزی ئینسانی باس دەکات. لە بەیتی دڵداریی کوردیدا دەروونی پڕ جۆش‌و خواستی جوان‌و نیهادی پاکی ژن‌و پیاوی کورد ڕەنگ دەداتەوە.

داستانی دڵداری لە هەموو جیهاندا، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتدا سۆزێکی تایبەتی‌و هەستێکی قووڵ‌و ڕاست گۆییەکی ڕووداویی تێدایە، بەلام

داستانی دڵداریی کوردیی سەرەڕای سۆزو هەستو خۆشەویستیو وەفاداریو ڕاستگۆیی، جۆرێك لە ئازایەتیو فیداکاریش دەردەخات، بەڵکو لە زۆربەی ئەو داستانانەدا وێنەی خۆ بەخت کردن لە ڕێگەی عەشقی پاکدا ژوور هەموو وێنەیەك دەکەوێتو دڵدار وەك فیداکارو شەهید پیشان دەدرێت، ئەمە لە داستانی (خەجو سیامەند)و (مەمو زین)دا زۆر ئاشکرایە.

لە بەیتی دڵداریی کوردیدا، گەلێك ڕوخساری کۆمەلایەتیو خووڕەوشتی کوردیش بە جوانی ڕەنگ دەداتەوە، تەنانەت هەستی قووڵی زەحمەت کێشانو زۆر لێ کراوان لە پشت پەردەی خۆشەویستی دڵدارییەوە دەبێتە هاواری ناڕەزاییو وەڕسی بەرامبەر بەو ڕەنج خۆرو زۆردارانەی خۆشەویستیشیان کردووە بە موڵکی دەستەی ڕەنجو خۆرو دەیانەوێت پیرو هەژارو ڕەنجبەری لێ بێ بەری بکەن.

لە داستانی دڵداریی کوردیدا وێنەی پاكو ڕووی سوورو ڕەنگینی ڕەنجبەران نەخشە دەکێشرێت.

بێگومان تا ئێستا بەشی زۆری داستانی کوردی (چ داستانی قارەمانیو چ داستانی دڵداری) تۆمار نەکراون، واتە هێشتا لە سنگی ئەو گۆرانیبێژانەدان کە دەیانگێڕنەوەو هێشتا بە نووسراوەیی چاپ نەکراون، بەڵام هەر بە بیستنو بەو داستانە کەمانەدا، کە چاپ کراون، دەتوانین ئەو دیمەنانەی سەرەوە ببینینو داستانی وەك (خەجو سیامەند، لاسو خەزال، بارامو گوڵەندام، میروو وەفا، حەسۆو زڵخ، کەریمو ستی، ناسرو ماڵ ماڵ ...هتد) بکەین بە نموونە.

لێرەدا دەتوانین چەند نموونەیەك لە داستانی کوردی بخەینە ڕوو بیانکەین بە بەڵگەی ئەو هەنگاونانەی داستانی کوردی، واتە هەنگاونان لە ئەدەبی فۆلکلۆرەوە بۆ ئەدەبیاتی نووسراو، هەروەها لەو باسانەی لە بەشی بەرنامەو خوێندنەوەی چەند ساڵەتاندا، دەیانبینین دەتوانن بەڵگەو نموونەی تەواوی ئەو دیاردەیە ببینین‌و بەهۆی ئەوانەوە لە بەشێکی گرنگی بەرهەمی سەرزارو نووسراوی کوردی بگەن، کە داستانە.

چەند نموونەیێک:

## ١. شیرین خەسرەو

داستانی شیرینو خەسرەو یەکێکە لەو داستانانەی کە لەناو گەلانی ڕۆژهەڵاتدا باوەو چەند شاعیرێك بە چەند زمانێکی ڕۆژهەڵاتی دایان ڕشتوەو لەشێوەی فۆلکلۆرەوە دەرچووەو خراوەتە سەر شێوەی نووسین.

داستانەکە باس لە خۆشەویستییەکی بێ وێنە دەکات لەنێوان خەسرەوی کوڕی پەروێزی کوڕی نەوشێروانو شیرینی کچە شۆخی برازای (شەمیرا)ی شاژنی ناوچەی (مەهستان) لە دەوروبەری دەریاچەی (خەزەر). ئەو داستانە دڵدارییە ئەنجامێکی تراژیدییانەی ناخۆشی دەبێت، کە بە کوشتنی خەسرەوی پەروێز لەلایەن کوڕەکەی خۆیەوە کە ناوی (شێرەوەی) بووە کۆتایی دێتو هەروەها بە خۆ کوشتنی شیرین بە ئەنجام دەگات، داستانەکە وێنەی خۆشەویستییەکی داوێن پاکانە دەخاتە ڕوو، هەر لە درێژەی چیرۆکەکەدا ناوی (فەرهاد)یش دێتە گۆڕێ، کە ئەویش دەکەوێتە داوی عیشقی شیرینەوە، هەر لە ئەنجامی ئەم عیشقو ئەڤینەوە مەرجی وای بەسەردا دەسەپێنن کە لەتوانای مرۆڤدا نەبێت وەك کونکردنی شاخی بێستون یا کێوی بێستون کە دەکەوێتە ناوچەی قەسری شیرین لە کوردستانی ئێراندا.

ئەم داستانە بە زمانی کوردی– شێوەی گۆران– لە لایەن خانای قوبادیو ئەمیر خەسرەوی دەلهەوی نووسراوەتەوە، ئەم نموونەیە

لـەوەی خانـای قوبادییـە، کـە شـاکارێکی ئەدەبییـەو بـە ٥٥٢٦ بـەیت هۆنراوەتەوە.

**ئەمەش چەند دێڕێکە لە داستانەکە:**

**شیرین جەی گوفتار دەروونش جۆشـــا**
**چۆن بەحری قولزم جەقین خرۆشـــا**
**پەنجەی ڕەنگین بەرد جەخیشم پەروێــز**
**پارەکەرد یەخەش چون غونچەی نەوخێز**
**جە جامی نێرگز ئەو سیمین عـــوزار**
**بەرگی سەمەن کەرد بەلالەی بەهـــار**
**بە توونەی بەخیشم واتش بە شاپـــوور**
**خوسرەو بێ شەرمەن هەم جە خودا دوور**

(هەمووی بۆ لەبەر کردنە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| جەی | : | ئەم، ل ئەڤ |
| گوفتار | : | گوتار، قسە، ئاخافتن. |
| دەروونش | : | دەروونی، هەناوی، هناڤاوی، دەرووناو. |
| جۆشا | : | هاتە جۆشان، کوڵا، کەلی. |
| چون | : | وەکو |
| بەحری قولزم | : | دەریای سۆر. |
| جەقین | : | لەڕقو کینە، ژ رق و کینەو بوغز. |

| | | |
|---|---|---|
| خرۆشا | : | هاتە خرۆشان. |
| بەرد | : | برد، بر |
| جەخیشم | : | لەرقو تورەیی، ژ تورەییٚ |
| پارەکەرد | : | پارچەی کرد، پارکر. |
| ئەو سیمین عوزار | : | غونجەی تازە هەڵچوو |
| ئەو ڕوخسار سیمین | : | ئەو دەمو چاوە سپییەی وەکو زیو (وەکی زیڤ) |
| سەمەن | : | یاسەمین |
| وەهار | : | بەهار |
| واتش | : | گوتی، وی گۆت |
| بیٚ شەرمەن | : | بیٚ شەرمە، هیچ شەرم ل نك وی نینە. |
| جە خودا درۆور | : | لەخودا دوو، دویرە ژ خودیٚ. |
| یاوە | : | بەلاڤە |
| گۆڕیٚ | : | مەیدان |
| داو | : | داڤ |
| شاخ | : | کێو: چیا |

## ٢. مەم و زین

مەم و زین لە جیهانی ئەدەبیاتی کوردیدا هەمیشە لەگەڵ ناوی (ئەحمەدی خانی)یەوە دێت، چونکە خانی ناوەڕۆکی مەم و زینی لە (مەمی ئالان)ی فۆلکلۆری سەر زاری خەڵکەوە وەرگرتووە، پاش دەستکاری کردنی زۆری ناوەڕۆکەکەی.

خانی ڕووداوەکانی ناو داستانەکەی سەر لەنوو بەزیاتر لە (٢٥٥٠) دێڕ هۆنراوە دارشتووەتەوە کە دەتوانین بیکەین بە سێ بەش:

١. دیباجە (پێشەکی)، کە (١٨٨) بەیتە شیعرە، کە تیایدا باسی ئاین و فەلسەفەو تەسەوف و مەدحی پێغەمبەر دەکات، لەمانەش (١٧٣) بەیتی لەبارەی کوردایەتی و هۆی دانانی پەرتووکەکەیتی بە زمانی کوردی و ئاشناکردنی خوێنەرە بە داستانەکە.

٢. ناوەڕۆکی چیرۆکەکە، کە تیایدا باسی چیرۆکی ئەڤینی دەکات و ڕووداوەکانی بە (١٩٤٨) بەیتە شیعر دەگێڕێتەوە.

٣. کۆتایی کە بریتییە لە (٢٤٦) بەیت.

### مەم و زینی خانی چەند سیفەت و ئەدگارێکی پێوە دیارە کە ئەمانەن:

١. وشەو پەیڤی بێگانەی (بەتایبەتی عەرەبی) زۆر تێدایە، کە ئەگەر خانی بیویستبایە دەیتوانی وشەی ڕەسەنی کوردی لە باتی زۆربەیان بەکاربهێنێت.

٢. زۆر پەیڤ و وشەی لە بەشە شێوەکانی تری کرمانجی ژووروی تێدایە، کە وا دیارە خانی شارەزای هەموو لقە شێوەکانی کرمانجی

ژووروو بووەو سودیشی لە هەموویان وەرگرتووە، ئەمەش یەکیەتی زمانی ئەدەبی کرمانجی ژووروو دەنوێنێت.

٣. مەمو زینی بە زمانێکی سادەو ئاسانو ڕەوان نووسیوە، تەنانەت ئەو خوێنەرەی کە بە کرمانجی خوارووش دەدوێت، لێی تێدەگات، ئەمەش دەسەڵاتی ئەحمەدی خانی نیشان دەدات بەسەر هەموو شێوەکانی زمانی کوردی.

٤. سەرواو قافیەی شیعرەکانی (مەمو زین) لە بابەتی شیعری (مەسنەوی)یە، واتە دوو نیوە دێڕی هەر بەیتێکی لەسەر یەك قافیەیە، ئەم قالبە شیعرییەشی لە شاعیرانی فارس وەرگرتووە، وەکو لە نموونە شیعرییەکەی خوارەوەدا دەردەکەوێت.

**خانی دەستکارییەکی زۆری ناوەڕۆکی داستانی فۆلکلۆریی (مەمی ئالان)ی کردووە، بەم جۆرە:**

١. خانی زۆر دیمەنی ئەفسانەیی لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکە لاداوە.

٢. دەستکاری کاتو شوێنی ڕووداوەکانی کردووە، ئەوەتا چیرۆکەکەی لەڕۆژی جەژنی نەورۆزدا دەست پێکردووە، شاری (جزیرێ)ی کردووە بە شوێنی ڕووداوەکان کە ماوەی ساڵێکیان خایاندووە، مەمو زینی بە جووتە کردووە بە خەڵکی جزیرێ.

٣. ناوی زۆربەی کەسانی داستانە فۆلکلۆرییەکەی گۆڕیوە، بۆ نموونە (میر ئەژین)ی کردووە بە (میر زێندین).

٤. داستانە فۆلکلۆرییەکەی خستوەتە سەر شێوەی داستانێکی شیعری کە بەو جۆرە چووەتە ڕیزی ئەدەبیاتی کلاسیکی ڕۆژهەلاٌتو، بووە بە لوتکەی ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی.

**دیارە مەبەستی خانی لە دانانی داستانی مەمو زین دوو شتی سەرەکی بووە:**

١. بە هۆیەوە بەرگری لە بیرو باوەڕە تەسەوفیو فەلسەفیو نەتەوەییەکانی خۆی بکات مەمو زین بکات بە بەهانە بۆ دەربڕینی هەرچی لەدلٌ دایە دەربارەی باری ژیانی کوردو مەسەلەی نەتەوەیی:

**شەرحا غەمێ دل بکەم فەسانە**

**زینێ ئو مەمێ بکەم بەهانە**

٢. بۆ ئەوەی ئەوە جێگیر بکات کە کوردیش خاوەنی میراتێکی گیانیی ئەو تۆیە کە لەمیراتی گیانیی نەتەوەکانی تر کەمتر نییە.

**نموونەیەك:** ئەمە نموونەیەکە لە داستانی مەمو زین، کە لەسەر زاری زینی گوتراوە، کە زین لەبەر خۆیەوە، دوای زیندانی کردنی (مەم) دلٌو گیانی خۆی دەدوێنێت.

**ئەی دلٌ، تو ژ قەلبێ من ب دەرکەڤە**

**وەی جان، توژی بۆ دلێ ب بەرکەڤە**

**هون هەردوو هەڕن مەمێ ببینن**

**لێ یەك خەبەری ژ بۆمە بینن**

**ئەی دلٌ، توکو لێ دکەی سەلامی**

**زو بینەڤە، بۆ مەڕا پەیامی**

**کانی ب چه حاله ئەو گرفتـــار؟!**
**دانین چه خەیاله ئەو دڵ ئەڤگار**
**کانی ل مه ئاشه، یانه زیــــــزه**
**باخی وی بەهار یا پەییـــــــزه**
**خۆش ڕەنگو لەتیفه شوبهی سۆرگول**
**یان، ژارو زەعیفه میسلی بولبـــول؟!**

(هەمووی بۆ لەبەرکردنێیە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

↑ ↓

| | | |
|---|---|---|
| ب دەرکەڤ | : | دەرکەوە، دەرچۆ. |
| ب بەرکەڤ | : | بەرکەوە، بکەوەبەری. |
| هون | : | ئێوە، ئەنگۆ، هنگ |
| هەڕن | : | بڕۆن، بچن. |
| بینەڤە | : | بهێنەوە. |
| ل مه ئاشه | : | لە گەڵمان دۆستە. |
| ژار | : | هەژار. |
| کولێ دکەی سەلامی | : | کاتێ کە سڵاوی لێ دەکەی. |
| شوبهی سۆر گول | : | وەك سۆرە گوڵ |
| هەرگاڤ | : | هەمیشە |
| بەڕڤانی | : | بەرگری |
| بەهانە | : | مەهانە |
| ئەوسا | : | ئەوتۆ |

# پەندی پێشینان

**پەندی پێشنان/** بەرھەمێکی فۆلکلۆری زۆر کۆنی باب‌و باپیرانە، لە ئەنجامی بەسەرھات‌و کارەساتەوە لەھەموو ڕوویەکی ژیانەوە کە بە سەریان ھاتووە جۆرە پەندێکیان لێ وەرگرتووەو بە چەند وشەو پەیڤێك یان چەند ڕستەیەکی کورت‌و ڕەوان، بە ھەڵبەستێکی سادەو ئاسان کە زیرەکی خۆیان‌و یاسای ژیانی ئەو کاتەو لەوە پاش نیشان دەدات، ڕێکیان خستووەو بە یادگار بۆ نەوەی دوایی بەجێیان ھێشتووە کە لەژیانیاندا لەسەری بڕۆن‌و بەو ڕەنگە ڕەفتار بکەن.

ھەر نەتەوەیەك پەندی تایبەتی خۆی ھەیە کە داب‌و نەریتی ساڵەھا ساڵی ڕۆڵەکانی دەئاخنێتە ناو وشەکانی‌و... بە چەند پەیڤێکی ئاسان‌و ڕستەیەکی کورت سەر بۆرو سەرگوزەشتی چەندین کەس پیشان دەدات‌و ناوەڕۆکی چەندین بەسەرھات‌و ڕووداو ڕوون دەکاتەوەو ھەوێنی زۆرەھا ئەزموون دەداتە دەست‌و... بە ئامۆژگاریی گەش‌و پڕ سوودو، واتای قوول‌و پرشنگدار مەیدانێکی بەرینی ژیان ڕووناك دەکاتەوە.

نەتەوەی کوردیش وەکو نەتەوەکانی تری جیھان پەندی واتا مەندو پڕ مەبەستی وای ھەیە کە چۆنیەتی ژیانی باب‌و باپیرانمان بەدەر دەخەن.

دیاره پەندی کوردیش هەندێك سیفەت و تایبەتمەندی لە خۆی دەگرێت، وەك:

١. پەندی کوردی بەڵگەنامەو ئاوێنەی مێژووی هەزاران ساڵەی نەتەوەی کوردە.

٢. زۆربەی پەندە کوردییەکان، پێوەرن بۆ پێوانی ڕادەی هۆشیاریو کارامەییو لێهاتوویی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد.

٣. پەندی کوردی، لەزۆر باردا بووەتە ڕابەرو ڕێبەرو ڕێنیشاندەری خەڵكو چارەی باشی بۆ کێشەو ئاستەنگەکانی بەردەم ئەو خەڵکە دۆزیوەتەوە.

٤. هەموو کات پەندی کوردی خوو ڕەوشتو ڕەفتاری چاکی لەناو گەلدا چەسپاندووەو تۆوی گیانی خۆشەویستیو هاوکاریو زبارەو یاریدەدانی لە دڵیاندا چاندووە.

٥. بە گشتی پەندی کوردی وشەو پەیڤی ڕەسەنی کوردی دەگرێتە خۆیو لەم لایەنەوە دەتوانرێت سوودێکی زۆری لێ وەربگیرێت بۆ دارشتنو هەڵسەنگاندنی وشەی تازەو ڕەسەنی کوردی.

ئاشکرایە کە ماوەیێکی زۆر درێژە خاکی کوردستان پارچە پارچە کراوەو، گەلی کوردیش بەسەر چەند دەوڵەتێك دابەشکراوە کە تا ئێستاش ئەو بارە ناسروشتییە هەر لە ئارادایە. پێشتریش دوژمنانی یەکگرتنی کورد چاویان بریوەتە خێرو بێرو بەرو بومو سەرو سامانی خاکی بەپیتی کوردستانو... لەبەر زۆر ئەگەران ڕۆڵەکانی کوردیان لێك دوور خستۆتەوە کە یەکەم ئەنجامی کارە نارەواکەیان پەیدابوونی چەند دیالیکتێکی زمانە، بەڵام خۆش بەختانە ئەم دیالێکتانە ڕەگو ڕیشە

کوردییە ڕەسەنەکەیان هەر ماوەو... بە پێچەوانەی خواستی ناحەزان زمانە شیرینەکەمان بەم دیالیکتانە پتر دەوڵەمەند بووەو، فەرهەنگی وشەو زاراوەکان گەورەو فراوانتر بووە.

دیارە باپیرانمان بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی تەرازووی ژیان زۆر ژیرانە پەندیان داڕشتووەو باری بەڵگە نەویستی سروشتیان خستۆتە ناو پەیڤەکانی‌و، بۆ ڕۆڵەکانیان جێ هێشتووە کە مەبەستیان پەروەردەکردنی نەوەی ڕەسەن‌و خاوەن نەژادی بێگەردی کورد بووە... بۆیە گوتویەتی:

**(( چ بچینی ئەو دەدووریێەوە ))**

کە لەڕواڵەتدا- گوێگرو خوێندەوار- ئەم پەندە بە بەڵگە نەویستێك دادەنێت‌و، دیاریشە ئەوەی گەنم بچێنێت هەر گەنم دەدوورێتەوە نەك نیسك‌و نۆك‌و ماش کەچی لە ناوەڕۆکدا مەبەستی پەروەردەکردنی منداڵەو، بەم چوار وشەیە پرۆگرامێکی گشتگری پەروەردەو فێرکردنیان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئەوەندەی قوتابخانەیەك ڕۆڵێکی کاریگەری هەیە.

**بەرامبەر ئەم پەندەش‌و بۆ هەمان مەبەست پەندێکی ترمان هەیە کە دەڵێت:**

**(( چ بکەنە کارێ ئەو دێ هێتە خارێ ))**

هەمووومان دەزانین کە ژیانی باپیرە گەورەکانمان زۆر ئاسان‌و ئاسایی بووە، شێوەی خانووەکانیشان بە پێی پێویستی ئەم ژیانە بووە، کەواتە هەر لەناو خانوودا کۆگایێکی دروست دەکرد کە خانە خانە بوو، ئەم خانانە لە ژێرەوە کون بوون، هەر خانەکیان بۆ جۆرە دانەوێڵەیەك تەرخان دەکرا، ناوی ئەم کۆگایە (کار) بوو.

ئیتر وەکو لێکدانەوەی پێشوومان، لە ڕواڵەتدا ئەو (کار)ەی برنجی تێ دەکرا هەر برنجەکە لە کونەکەی خوارەوەی دەهاتە خوارێ، کەچی لە ڕامانو مەبەستدا ئەم پەندە وەکو پەندەکەی پێشوو پەروەردەو فێرکردنە.

بۆ پەسندکردنی کاری باشو ڕێزگرتنی کاتی ڕەخساویش، باپیرانمان پێیان لەسەر ئەوەی داگرتووە کە پێویستە کاتو دەرفەت لە دەست خۆمان نەدەین، پێشی ماوەی خۆی ئامادەباشی بۆ بکەینو هەلو مەرجەکانی سەرکەوتنی کارەکانمان لەکاتی خۆیاندا ئامادەو دابین بکەین، ئەگینا ئیشو کارە ئاسانەکانمان گران دەبنو دەرفەتەکانیشی تێدەپەڕنو ناگەڕێتەوە، بۆیە گوتویانە:

**((گرێی دەستان مەدە بەر ددانان))**

**((ئەو گرێیا ب دەستان ڤەدبیت، ب ددانان ڤەنەکە))**

دیاریشە کورد لە سەرەتای ژیانییەوە ئاشتی خوازبووە، هێمن بووە، ژیانی تەبایی لەگەڵ یەکتریو کەسانی تریشی پێ خۆشبووە، مافی کەسی نەخواردووە. ئەگەر ڕاپەڕی بێتو شۆڕشی بەرپا کردبێت هەر لەپێناو وەرگرتنی مافە خوراوەکەی بووە، ڕیش سپیو هۆشمەندەکانی هەمیشە خەڵکیان هێورکردووەو هەوڵی وەیان داوە ناکۆکی لە نێوان خەڵکدا نەهێڵنو ئاگری مرۆڤە هەڵچووەکان دابمرکێنن.

ئەم پەندە جوانەیان لە مێشکی ڕۆڵەکانیان جێگیر کردووە:

**(( خوێن بەخوێنی ناهێت شویشتن ))**

کورد ویستویەتی بەری دەستی خۆی بخواتو خوە و ئارەقەی نەوچەوانی خۆی بخواتەوە بۆیە هەمیشە ڕەنجی کاری خۆی پێ خۆشتر بووە لەمنەتی خەڵکیو، لەپێناو نانو ژیاندا کارو خەباتی کردووەو ماندووبوونی نەزانیوە، بۆیە گوتوویەتی:

**(( نانێ خۆ بخۆ ب ئاڤێ، منەتا خەلکی پاڤێ ))**

**(( گۆشتی ڕانی خۆت بخۆ، منەتی قەساب هەڵمەگرە ))**

هەر بەم شێوەیە کورد مرۆڤی ئیشکەرو ڕەنجدەری خۆش ویستووەو ڕێزی گرتووەو بە چاوێکی بەرز سەیری کارەکەی کردووە:

**(( دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە ))**

**(( کارکەری خۆ بە خۆشتڤیێ خەلکی ))**

هەروەها بابو باپیرانی کورد هەموو شتێکی ڕاستیان پێ باش بووە، واتە لە کارەکانیاندا دڵسۆزو لە گفتەکانیاندا ڕاستگۆ بووینەو، لەهیچ کاتو شوێنو هەڵوێستێکدا لەڕاستییان لانەداوەو لە گۆتنی قسەی ڕاستو لە کردنی کاری ڕاست نەترسانو، دلێرانە بەرگرییان لە (ڕاستی) کردووە چونکە باوەڕیان بووە کە:

**(( ڕاستی دناڤ ئاگریدا نا سوژیت ))**

هەر ئەم (ڕاستی)یە هێزی وا دەداتە خاوەنەکەی کە ئازاو دلێرانە ڕێی شێر بگرێتو لێی نەترسێت.

**((ڕاست بەو ڕێی شێر بگرە ))**

ئیتر بە سەدان پەندی زیندیو کاریگەرمان بۆ ماوەتەوە کە وەکو مۆمی گەشی شەوە زەنگ تاریکی دەڕەوێنێتەوەو ڕێگاکانی ژیانمان بۆ ڕووناك دەکەنەوە، بەڕاستی:

(( گوتنێن مەزنان نەخشێ ل بەری نە ))

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

| ↓ | | ↑ |
|---|---|---|
| ئەو کاتە | : | وی دەمی |
| لەوە پاش | : | پشتی وی |
| دابو نەریت | : | عەدەت |
| دە ئاخنێتە | : | د حەشرینیتە |
| ئامۆژگاری | : | شیرەت |
| پڕ سوود | : | پڕ مفا |
| قووڵ | : | کویر |
| بەرین | : | فرەهـ |
| پڕ مەبەست | : | پڕ ڕامان |
| وا | : | وەسا |
| لە خۆیدا دەگرێت | : | تێدا هەنە: ڤەدگریت |
| ئاوێنە | : | خۆدیك |
| زۆربەی | : | باهراپتر |
| پێوەر | : | پیڤك |

ڕۆلەکان : کوڕێن

کێشە : دۆز

تۆو : تۆڤ

ئێستا : نهۆ

لە ئارادایە : مایەو هەیە

بەروبۆم : دەرامەت

بەپیت : قەلەو

جێ هێشتووە : هێلایە

خاوەن : خودان

بۆیە : لەوا

لە ڕۆلەتدا : ژ ڕوییێ دەرڤە

لە ناوەڕۆکدا : ژ ڕوییێ ژوورڤە

هەمان : هەروێ

ئاسایی : سادە

دانەوێڵە : دان، وەك برنجو ساڤارو...

ڕەخساو : هەلکەڤتی

دابین بکەین : بەرهەڤ و مسۆگەر بکەین

دابمرکێنن : ڤەمرینن

ویستۆیەتی : ڤیان

ماندوبوون : وەستیان

## لێکۆڵینەوەی تازەی ئەدەبی کوردی

پێشتر زانیمان کە بناغەو سەرچاوەی ئەدەبیاتی کوردی وەك ئەدەبیاتی گەلانی تر دەچێتەوە سەر فۆلکلۆر. واتە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی لە ئەدەبی نووسراو کۆنترەو سەرچاوەی ئەوە، بەڵام دەتوانین بپرسین ئەدەبی نووسراوی کوردی لە کەیەوە دەستی پێکردووە؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەتوانین پشت بە بیرورای چەند کەس لە شارەزایانی ئەدەبیاتی کوردیو زانایان ببەستین. ڕەنگە جاروبار ڕای ئەو شارەزاو زانایانە هەندێك جیاواز بێتو هەر یەکە شاعیرێك بە یەکەم شاعیری کورد دابنێت. هەندێکیان سەرەتای ئەدەبیاتی کوردی دەبەنەوە بۆ پێش ئیسلامو هەندێکیان لەگەڵ ئەوەشدا کەنکۆڵی لەوە ناکەن کە کورد پێش ئیسلام هۆنراوەی هەبوو بێت، بەڵام بەڵگەو نموونەیەکی ئاشکرا بۆ ئەو هۆنراوانە نابینن.

لەبەر ئەوە سەردەمی سلجووقی بە سەرەتایەکی ڕوونو بێ گومانی هۆنراوەی کوردی دادەنێن. واتە هەر لەو سەردەمەوە کە دوەیلاتی ئیسلامی پەیدا بوو، نەتەوە موسڵمانە نا عەرەبەکان چوونەوە سەر زمانی زگماکی خۆیان زمانی کوردیش ئەو ڕێگایەی گرتو لەناو کوردیشدا ئەدەبیاتی نووسراو بە ئاشکرا پەیدا بوو.

لێرەدا دەبێت ئەوە بزانین کە شارەزایانی ئەدەبی کوردی هەر لە سەرەتاوە پلەکانی ئەدەبیاتی کوردی بە چەند جۆرێك دابەش دەکەن:

١. به پێی شێوەکانی (زاراوەکان): هەندێکیان تەماشای ئەو شێوەیەی زمان دەکەن کە بەرهەمەکەی پێ نووسراوە، کە ئەمیش چەند هۆیەکی مێژوویی هەیەو بەستراوە بە مێژووی کوردو میرنشینەکانیو مێژووی لەمەو دوایەوە.

ئەمانە چوار پلەی ئاشکرا بۆ ئەدەبیاتی کوردی دادەنێن، یا دەیکەن بە چوار جۆر کە ئەمانەن:

ئـ- ئەدەبیاتی شێوەی لوڕی.

ب- ئەدەبیاتی شێوەی گۆران (گۆرانی).

پ- ئەدەبیاتی شێوەی کرمانجیی ژووروو (بۆتانی- بادینانی- هەکاری).

ت- ئەدەبیاتی کرمانجیی خواروو کە لە سلێمانییەوە دەست پێ دەکاتو بەشە شێوەکانی (سنە- موکریان- سۆران) دەگرێتەوە.

٢. بەپێی ساڵی لەدایکبوون: هەندێك مێژوو نووسی ئەدەبیاتیشمان هەن کە بەپێی ساڵو یەك لەدوای یەك بە پێی ساڵی لەدایك بوونو مردن بەڕیز باسی شاعیرانو نووسەرانو بەرهەمیان دەکەن.

٣. بەپێی قوتابخانەی ئەدەبی: هەندێك لە مێژوو نووسانی ئەدەبیاتی کوردی، بەپێی قوتابخانەو پەیڕەوی ئەدەبی سنوورێك بۆ چەشنەکانی ئەدەبیاتی کوردی دادەنێن.

قوتابخانەی ئەدەبی (ڕێبازی ئەدەبی)، ئەوەیە کە کۆمەڵە هۆنەرو نووسەرێك یەك ڕێبازیان هەبێتو لەڕووی بیرو ئەو باسانەوە کە دەریان

دەبڕن نزیکی یەك بن‌و گەلێك دیمەنی ئەدەبی بە یەکتریانەوە ببەستێت، یا هەریەکە چێژێکی تایبەتیش لە بەرهەمەکەیدا ببینرێت.

بەشێوەیەکی گشتی لە ئەدەبیاتی کوردیدا سێ جۆرە قوتابخانەی ئەدەبی دەبینرێت کە ئەمانەن:

**ئ- قوتابخانەی کلاسیکی (ڕێبازی کلاسیکی):** ئەوەیە کە کۆمەڵە هۆنەرو نووسەرێك لەسەر ڕێچکەیەك دەڕۆن کە گەلێك کەس لە پێش ئەوانەوە لەسەر ئەم ڕێچکەیە ڕۆیشتووە، هەتا وای لێ دێت ناتوانن بەهیچ شێوەیەك لەم ڕێگەیە لابدەن، بەڵکو هەر لاسایی‌و پەیڕەوی ئەوان دەکەنەوە، وشەو دەربڕینەکانی ئەوان دووبارە دەکەنەوە، زیاتر گرنگی بە ڕوخسارو وشەکاری دەدەن، کێشی عەرووزو قافیەی شیعری عەرەبی بەکاردەهێنن.

بەشێوەیەکی تێکڕایی ئەدەبیاتی نووسراومان هەر لەو کاتەی کە پەیدابووەو ماوەتەوە واتە لەسەردەمی سلجووقییەکان هەتا سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانەوە بەر قوتابخانەی ئەدەبیی کلاسیکی دەکەون، هەروەها داستانە کۆنەکانی کوردی کە بە زاراوەی گۆران (هەورامی) یا بە زاراوەی کرمانجیی ژووروو (بەشی بۆتانی) نووسراون، تێکڕا دەچنە ڕیزی ئەدەبیاتی کلاسیکیی کوردییەوە. ئەمەش نموونەیەکە لە هۆنراوەی کلاسیکیی کوردی، نالی دەڵێت:

**هەر چەندە کە عومری خدرو جامی جەمت بوو**

**چونکە ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو**

ئەی جامیعی دونیاو قیامەت بە خەیاڵات

ئەو ڕۆژە کە مردی نە ئەوت بوو نە ئەمت بوو

بێزارە لە تۆ ئێستە هەم ئاغووشی عەدووتە

دونیا کە لەکن خۆت حەرەمی موحتەرەمت بوو

دوێنێ چ بوو دەتدا بەزمانی لافی کەرامەت

ئەمڕۆ نە دەمت بوو نە دەمت بوو نە دەمت بوو

عومرت نەفەسێکە لە هەموو عالەمی باڵا

بمرە لە غەمی دا کە هەموو سەرفی غەمت بوو

وەك شەلتە پەیین گەهـ پڕو گەهـ خاڵییە بەتنت

سەوم ئەمەلت باعیسی نەفس و شکەمت بوو

نالی چییە وا میسلی جوعەل غەرقی شیاکەی

خۆ تۆ بە حیسابێ وەکو پەروانە شەمت بوو

(( لەسەرەتاوە پێنج دێری بۆ لەبەرکردنە))

**ب- قوتابخانەی ڕۆمانتیکی ( ڕێبازی ڕۆمانتیکی ):** بریتییە لە هیواو ئاوات و نا ئومێدی و فرمێسك ڕشتن. لە ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکیدا خەیاڵێکی فراوان دەبینرێت، زیاتر گرنگی بە ناوەڕۆك دەدرێت، لێرەدا ئەوەی پێویستە بوترێت ئەمەیە کە ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکی کوردی لە هیواو ئاوات دەربڕین و نا ئومێدی و گەڕانەوە بەرەو دواوە جیاواز بووە لەگەڵ ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکیی ئەوروپا، چونکە هی ئەوان بەستراببوووەوە بە چینێکی دیار کراوی کۆمەڵ، کە چینی بورژووازی بوو، ئەم چینە لەدوای

شۆڕشـــی پیـــشەسازی وەك چـــینێکی تـــازە ســـەری هەڵـدابوو، بـــەڵام ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکیی کوردی بەستراوە بە هەموو گەلی کوردەوە، هیواو ئاواتی هۆنەرانی کـورد سـەرکەوتنی گـەل بـووە، لـەکاتی سـەرنەکەوتن‌و نـسکۆو چەوسـاندنەوەدا بـێ ئومێـدی‌و ڕەشـبینی‌و فرمێـسك ڕشـتن لـە بەرهەمەکانیاندا دەرکەتووە.

ئـەدەبیاتی ڕۆمـانتیکیی کـوردی لـەدوای جـەنگی یەکـەمی جیهانـەوە وەکو ڕێبازێکی ئـەدەبی سـەری هەڵـداوەو تـا جـەنگی دووەمـی جیهـان‌و دواتر بەردەوام بووە.

ئەمـەش نموونەیەکـە لـەهۆنراوەی ڕۆمـانتیکیی کـوردی، کـە دڵـدار دەڵێت:

**خەندەکەی بایی**

**لە ئافاقی ژیانی نا ئومێدیم خەندەکەی بایی**
**فریشتەی پاکی هیوامی نیشاندام وا کە بیدوێنم**
**پڕیشکی تیشکی ئەستێرەی جوان ئیمشەو بە ئەسپایی**
**بە سۆزی هاتە نێو کونجی دڵی تاریکی پڕ خوێنم**
**دەسا ئەی مەسدەری هەستی**
**دەخێرا لادەری پەستـــــــی**
**وەرە تا من بە ڕازی تۆ نەمامی شادی بڕوێنم**

★★ ★★

جوانی غونچەییێ بوو وا کە پەنجەی ڕازی ڕاکێشای

دە سەیری چەند بە وەسلی زولفی خاوت شادو مەسرووورە

لەڕووی ڕاستی ئەتۆش وەك ئەو گولێکی چیمەنی دونیای

کەچی تاجی دڵی هێشتا دڵت لەم حالە ڕەنجوورە

بەخەندەی نەرمی دڵ پاکیت

ئەخۆم سوێندێ بە ڕووناکیت

ئەگەر هەستێ بە ژین وابێ لە جەرگی ڕاستیا دوورە

★★ ★★

هەمووی نووری ژیانە فەیزو نووری ئاسمانی شین

هەموو چەپلەی گوشادی لێ ئەدەن هەرچی کە ئەی دینی

لەسەر ئەم خاکە گەردێکین دە ئێمەش ڕوو لەشادی بین

فەراموش بکەین جارێ چەژی تاڵاوی غەمگینی

بەدڵ ڕوونیو ڕوو خۆشی

بە خەندە نەك بەخامۆشی

بنۆشین جامی دڵداری لەبەرکەین بەرگی نەمرینی

((کۆپلەی یەکەمی بۆ لەبەرکردنە))

**پ- قوتابخانەی ڕیالیزمی (ڕێبازی ڕیالیزمی):** ئەگەر پێناسەیەکی کورتی ڕیالیزم بکەین، دەتوانین بەو هونەرو ئەدەبیاتەی دابنێین، کە ژیان بە هەموو دیمەنو واتای قووڵو بەرینییەوە، بە چاوی ئەم هونەرمەندە یا ئەو نووسەرو شاعیرە پیشان دەدات، واتە ژیانو چۆنیەتی هەمەڕەنگەی فراوان هەیە کە چاوی هەر هونەرمەندێك

بەجۆرێکی دەبینێت‌و لە مێشکی هەر کەسێکدا بە چەشنێك ڕەنگ دەداتەوەو لای هەر کەسێك دەبێتە چەشنێك لە بەرهەم. ڕیالیزم ئاوێنەی ژیانە، هەر هونەرمەندێك بە چەشنێك ئەو ژیانە پیشان دەدات، بەڵام هونەرمەندی ڕاستەقینە ئەوەیە کە هونەرو بەرهەمەکەی دەبەستێت بە خەڵکەوە، ئاوێنەی خەباتی درێژی خەڵکە لە پێناوی ئازادی‌و بە خۆشی ژیاندا، دژی چەوساندنەوە بە هەر چەشنێك بێت، لە ئەدەبیاتی ڕیالیزمیدا گرنگی بەروخسارو ناوەڕۆك دەدرێت.

ئەگەر بەم چاوە تەماشای ڕیالیزم بکەین لە ئەدەبیاتی کوردیدا، ئەوا بە ئاشکرا ڕاستیی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئەدەبیاتی کوردی هەر لەبەر ئەوەی کە پێویستێکی ژیان لەسەرەتاوە هێناویەتییە کایەوە، کە پێویستیی گەڕانەوە سەر زمانی زگماکی کوردییە، لەبەر ئەوە هەر لەو سەرەتایەوە هەندێك ڕەگەزی دەربڕینی ژیانی خەڵکی تێدا بووەو ڕیالیزم لەزەویی ئەو ئەدەبیاتە ڕەگی داکوتاوە، ئەمەش بە تەواوی لە هۆنراوەی (بابە تاهیری هەمەدانی‌و فەقێی تەیران‌و ئەحمەدی خانی‌و حاجی قادری کۆیی‌و نالی‌و سالمدا ) دەبینین، بەڵام ڕیالیزم زۆری ویستووە تا بووە بە قوتابخانەیەکی ئەدەبیی دیارو سەربەخۆ، ڕێ‌و شوێنی دیاری هەبێت‌و دەست بەسەر هەموو بەرهەمی ئەدەبیی کوردیدا بکێشێت.

## کەی قوتابخانەی ڕیالیزمی کوردی سەری هەڵداوە؟

دەتوانین بڵێین سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهان، سەردەمی کۆتایی هاتنی قۆناغی ئەدەبیاتی کلاسیکیی کوردییەو دەست پێکردنی ڕێبازێکی تازەی ئەم ئەدەبیاتەیە کە ئەویش ڕیالیزمە وەکو سەرەتایەك، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ژیانی گەلی کورد پێویستیی بە بەرهەمێکی ئەدەبی هەبوو، کە هیواو ئاواتو داخوازییەکانی گەلی کوردی تێدا ڕەنگ بداتەوە، بەم جۆرە دەتواندرێت بوترێت، ئەدەبیاتی ڕیالیزمی کوردی لە نێوان جەنگی یەکەمو دووەمی جیهان سەری هەڵداوەو لە پاش جەنگی دووەمی جیهان بە تەواوی چەسپاوەو جێگیربووەو دەستی بەسەر ئەدەبیاتی کوردیدا کێشاوە، واتە لەو ململانەی نێوان ڕێبازە ئەدەبییەکاندا ڕیالیزم سەرکەوت.

## هۆیەکانی سەرکەوتنی ئەدەبیاتی ڕیالیزمی کوردی:

بێگومانە کە ئەم کێشەیە سەرکەوتنی ڕیالیزمە، شتێك نییە، لە خۆیەوە هاتبێتو نەبەسترابێت بە باری کۆمەڵایەتیو ئابووریو ڕامیاریی کوردستانو ناوچەکەوە، بەڵکو باری ئەو سەردەمەی جیهانیش کارێکی تەواوی کردە سەر ئەم کێشەیەو ئەنجامەکەی، بەتایبەتی ئەو گۆڕینەی کە بەسەر گەلێك لایەنی ژیانی مرۆڤایەتیدا هات لە ئەنجامی جەنگی دووەمی جیهانەوە، واتە هۆیە دەرەکییەکان، وەکو:

١. ژێر کەوتنی بەرەی فاشیزم.

٢. سەرکەوتنی بەرەی دیموکراسی.

٣. سەربەخۆ بوونی گەلێك لە وڵاتان وەك هیندستانو ئەندەنووسیا.

٤. کشانەوەی سوپای بێگانە لە سووریاو لوبناندا.

٥. سەرکەوتنی چینی کرێکار لە ڕۆژهەڵاتی ئەورووپاو چیندا.

٦. پێکهاتنی بەرەیەکی مەزنی سوشیالیستی.

لە کوردستانیشدا (واتە هۆی ناوەوە) دروست بوونی کۆماری کوردستان لە مەهابادو لەناوچوونی ئەو کۆمارە بە دەستی ئیمپریالیزمی جیهانو کۆنە پەرستانی ئێران، ئەمانە کارێکی گرنگیان کردە سەر ئەدەبیاتی کوردیو وای لێهات کە بتوانین ماوەی دوای جەنگی دووەمی جیهان بە سەردەمی بەرز بوونەوەو بەرەو پێش چوونی ئەدەبیاتی کوردی دابنێین، بەتایبەتی ڕێبازی ئەدەبیاتی ڕیالیزمی کوردی.

## باسەکانی ئەدەبیاتی ڕیالیزمی کوردی:

ئەگەر بچینە ناو ئەدەبیاتی ڕیالیزمی کوردییەوەو چاوێك بەو باسانەدا بخشێنین کە شاعیرانو نووسەران لێیان دواونو کردوویانن بە کەرەستەی ڕازاندنەوەی بەرهەمی خۆیان. ئەوانەی کە بەرهەمی ئەدەبیی ڕیالیزمیان نووسیووە، هەر لە ساڵانی پاش جەنگی یەکەمی جیهانەوە تا ساڵی (١٩٦١)ز ئەم چەند باسەی خوارەوە دەگرێتەوە.

١. باسی گیروگرفتی کۆمەڵایەتی‌و هۆی دواکەوتنی کوردەواری لەم بارەیەوە، واتە لە بارەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی‌و هەندێك دیمەنی شارستانیی تازەوە.

٢. ژیانی جووتیاری کوردو دیمەنی ڕەنج کێشان‌و ڕەنج بردنی‌و کێشەی نێوان جووتیارو دەرەبەگو دیمەنی خەباتی جووتیاری کورد.

٣. ژیانی کرێکاران‌و ڕەنگدانەوەی پەیدابوون‌و گەشەسەندنی چینی کرێکار لەناو کورداو لە هەموو عێراقدا، هەروەها ڕەنگدانەوەی بڵاوبوونەوەی بیرو باوەڕی چینی کرێکارو دەسەڵات سەندنی ئەو بیروباوەڕە، کە دەبێتە هۆی پتەوبوونی ڕۆڵی ڕابەرانەی کرێکار لە کۆمەڵدا.

٤. خەباتی ئازادی خوازانەی نەتەوەی کورد لە پێناوی مافی نەتەوەیی ڕەوای خۆیدا، کە ئەمە بەشێکی گەورەیە لەبەرهەمی ئەدەبیاتی ئەم سەردەمەمان‌و هەندێك لە شارەزایان ناوی دەنێن (( هۆنراوەی سیاسی لە ئەدەبیاتی کوردیدا )) دیارە هەر وەك خەباتی نەتەوەی کورد خۆی لە خەباتی ئازادی خوازانەی گەلانی ئەم ناوچەیەو هەموو جیهان نابێتەوەو بەشێکە لە خەباتی ڕەوای ئادەمیزادی ئەم سەردەمە بەرامبەر بە کۆنەپەرستی‌و سەرمایەداری‌و چەوساندنەوەو ئیمپریالیزم، هەروەها ئەم چەشنە بەرهەمەش لە ئەدەبیاتی کوردیدا باسی خەباتی نەتەوەی کورد لەو خەباتە قووڵ‌و فراوانە جیا ناکاتەوە.

هەر ئەم گیانە بەرزو بەنرخەی مرۆڤ وای کردووە کە نرخ دان بەمرۆڤ لە ئەدەبیاتی ئەم سەردەمەماندا ڕەنگبداتەوەو مرۆڤ بە بەرزترین‌و بەنرخترین سامان‌و سەرمایەی جیهان بزانرێت، هەر لەبەر ئەمەشە دیمەنی ئافرەت‌و سروشت لە ئەدەبیاتی ئەم سەردەمەماندا وێنەیەکی تازەی هەیە کە بەڕاستی بەرەو ئەوە دەڕوات کە لەگەڵ ڕێبازی ڕیالیزمی ئەدەبیاتی جیهاندا یەك بگرێت.

ئەم ڕێبازە تازەیەی ئەدەبیاتمان‌و ئەم باسانە تەنیا لە هۆنراوەی کوردیدا سەر هەڵنادەن بەڵکو لە پەخشانیشدا تەواو دیارن، لە پەخشانی کوردیدا دیمەنی ڕیالیزم‌و بەستراوی بە ژیانەوە لە دیمەنی هەموو ڕێبازەکانی تر ئاشکرا ترە.

ئەمەش بەستراوە بە سەردەمی پەیدابوون‌و گەشەسەندنی هەموو جۆرەکانی نووسینی پەخشان لە ئەدەبیاتی کوردیدا کە زۆرتری لە سەدەی بیستەمدایە، یا پاش جەنگی یەکەمی جیهانە، کە ئەمەش سەردەمی گەشەسەندنی ڕیالیزم خۆیەتی لە کاتێکدا کە ناوەڕۆك‌و باسی ئەدەبیاتی کوردی تازە بووەوە، بێگومان ڕوخساری ئەدەبەکەش بەرەو تازەوە بوون چوو.

**نموونە: (١)**

محەمەد شێخ حوسێن بەرزنجی کە بە (ع. ح. ب) ناسراوە لەم هۆنراوەیەدا ژیانی زەحمەت کێشان دەخاتە ڕوو.

## پەندی برسی

شەوو ڕۆژ من عەرد ئەکێڵم
بە دوای ئیش کردنا وێڵم
لەدەست برسێتی ڕائەکەم
ئەم لا ئەکەم، ئەولا ئەکەم
نەنان، نە ئیش هیچیان نییە
نازانم هۆی ئەمە چییە
هێزو تواناو تینی گەنجم
هەوڵو ئیش کردنو ڕەنجم
بیرو لێکدانەوەو هۆشم
بە نانە سکێ ئەفرۆشم
کەچی هێشتا لێم ناکرِن
دوای سوورِانەوەم نابرِن
ئەم خاوەن پارە زۆرانە
ئەم سەردارە خوێن خۆرانە
واتێ ماوم نازانم چۆن
پاروویەك نان، بەرگێکی کۆن
پەیدا کەم، ئەم ژەهری مار کەم

**بەویش ئەم ڕووتی یەم چار کەم**

**کاکـــه تـــۆ نـــازانی چـــیمه**

**هەرچی پارەو پوول بێ نیمە**

**ڕووتم عوریــــانم برســــیمە**

**(هۆنراوەکە هەمووی بۆ لەبەرکردنە)**

لەم هۆنراوەیەدا شاعیر ژیانی هەژاران‌و زەحمەت کێشانی خستۆتە ڕوو، دیمەنی چەوساندنەوەو ئێش‌و ئازاری ئەوانەی بێ ئێش‌و کارن پیشان داوە، بۆ مەبەستی چارەکردنی دەردی نەبوونی‌و برسێتی.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| ↓ | | ↑ |
|---|---|---|
| بناغە | : | بنیات |
| سەرچاوە | : | سەروکانی |
| لە کەیەوە | : | ژ کەنگی |
| ببەستین | : | گرێدەین |
| جیاواز | : | جودا |
| نکۆڵی | : | حاشا، ئینکار |
| بێگومان | : | بێ خش |
| بە پێی | : | لدویڤ |
| سنوور | : | تخووب |

چێژ : تام

تێكڕا : ڤێكڕا

فرمێسك : ڕۆندك، ئەسرین، ئەشك، هێستر.

لەكن : لنك

لاڤ : ڤڕ

شەڵتە پەین : جۆرە پەینێكە

پڕیشك : پرچك، كریسك

دەخێرا : دیٚ زوی

بڕوێنم : بچینم

فەرامۆش بكەین : ژبیر بكەین

ڕازاندنەوە : خەملاندن

## ٢. حەمدی

کارەساتی شەشی ڕەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ی شاری سلێمانی، یا ڕاپەڕینی ئەو ڕۆژەی خەڵکی شاری هەڵمەتو قوربانی بووە هۆی ئەوەی گەلێك شاعیری ئەو سەردەمە هۆنراوەی بۆ بڵێین، ئەو ڕووداوە کە لە لایەکەوە وێنەی قارەمانییەو لە لایەکەوە وێنەی قوربانیدانو جانەوەریی دوژمنە، بە فراوانیو هەمەڕەنگی چۆتە ناو هۆنراوەی سیاسیی کوردییەوە، یەکێك لە نموونەکانی ئەم مەبەستە ئەم چەند دێڕەی (ئەحمەد حەمدی ساحێبقران)ە، کە دەڵێت:

**١. بۆ هەوا ئاڵۆزە؟ بۆچی لێڵو سوورە ئاسمان؟**
**گێژەڵووکەی نەگبەتە یا فیتنەیی ئاخر زەمان؟**

**٢. ئەم هەموو لاوە نەمامن، نێژران لەم باخچەیە**
**ڕیشەیی کوردایەتی بوو، یەعنی بۆ مان نێژران**

**٣. جەژنی قوربانە، سلێمانی بە مەزبەح دانرا**
**کورد مەڕن، بۆیە بە جارێ هەر لەوێدا سەر بڕان**

**٤. بۆ شەریفی کورد خەڵاتە هاتووە سەر تابەپێ**
**یا کەلەپچەی دەستو تۆقی گەردن پێوەندیان**

**٥. بۆچ مەغۆڵ هەڵساوە یاخود دەوری نەحسی (جەن- گیز)ە**
**قەتڵو عامی ئەرمەنە یا حادیسەی ڕۆم بەبان**

٦. جارێ تەئریخی بنووسە، جا بگۆڕە قافیە
تا بەیاناتم بنووسی، لێت نەبێ حەرفێ نیهان...

٧. بێ (هەزار) ناوی سلێمانی بە تەئریخ (مەشهەد)ە
ئەم حیسابە عاقیبەت ڕۆژێ ئەبێ بیکا زەمان

٨. مەقسەدی ئەسڵیو ئەساسی هەر دوعاکەی پێشووە
ئێستە تیکراری بکە بەڵکە بکا مەبحەس ڕەوان

٩. (ڕەبی مووی لێبێ زەمانی، پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەر کەسێ گوڵشەن بەدەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ)

(تەنها پێنج دێر لە سەرەتاوە بۆ لەبەرکردنە)

## لێکدانەوە:

شاعیر لێرەدا سۆزێکی ڕاستەقینە بەرامبەر بە قوربانییەکانی شەشی ڕەشی ئەیلوول پیشان دەدات، هاوارێکی نارەزاییە بەرامبەر بە ڕشتنی خوێنی کورد، ئەوە پیشان دەدات کە دوژمن زۆر نا ئینسافانەو زۆر جانەوەرانە پەلاماری کورد دەداتو هەقی خوێنڕشتنی کوردییان بە خۆیان داوە، ئاسمان تەمەو ژیان ماتەمە لای شاعیر، شاری سلێمانی مەشهەدەو شوێنی بە ناحەق ڕشتنی خوێنی شەهیدانە، شاعیر دوژمنانی کورد دەخاتە ڕیزی دڕندەترین کەسانی مێژوو و خوێنڕێژانی مرۆڤایەتییەوە، بە مەغۆلو هۆلاکۆو جەنگیزخانیان دادەنێت، بەڵام دوا مەبەستی لەگەڵیاندا دەستی دوعا هەڵبڕینە بەوەی زمانیان مووی لێبێت، پەنجەیان هەڵوەرێت، وەك هێشتا شاعیر ئەو ڕێگەی تێکۆشانی شۆڕشگێڕییەی بەدی نەکردبێت کە شاعیرانی لەمەودوا بەدییان کردووە.

# بەشی نموونەی ئەدەب

١. مەلای جزیری.
٢. حاجی قادری کۆیی
٣. وەلی دێوانە
٤. پیرەمێرد
٥. گۆران
٦. هەژار موکریانی
٧. دیلان
٨. سەبری بۆتانی
٩. میقداد مەدحەت بەردخان
١٠. شاکر فەتاح

# مەلایێ جزیری

مـــەلایێ جزیـــری ئێکـــە ژ ناڤـــدارترین شـــاعیرێن کـــورد، نـــاوی (شێخ ئەحمەد)ە خەڵکی جزیرەی بۆتانە.

**گوڵی باغی ئیرەمی بۆهتانم　　　　شەب چراغێ شەبێ کوردستانم**

جزیری لە ساڵی (٩٧٥)ی کۆچی یا (١٥٦٥) زایینی ژ دایك بوویە.

بابەتێ هەرە سەرەکی شیعرا جزیری بخـۆ ڤـەگرتی عەشـق و ئـەڤینی بوو، بەلاّم ئەڤیناوی فەلسەفی و سۆفیاتی بـوو، ئـەڤینی مرۆڤـی لەگـەڵ ئەڤینی خوایی تێکەڵ کردیە، هەندێ جار ئەڤینداری (سەلما)یی و هەندێ جـاریش ئەڤینـداری خـودای بـوو، یەکێکـە لـە شـاعیرە کلاسـیکیەکان، شیعرەکانی لەسەر عەروزی عەرەبی داناوەو پەیڤێن بیانی زۆر تێدا بکـار دینان.

جزیری ژ بلی ناڤێ خۆ (ئەحمەد) دوو ناسناڤ د شـیعرێن خـۆدا بکـار دئینان:

١. **مەلا (مەلی):** چونکە مەلا بوو، سـەیدایێ مەدرەسـا (سـۆر) بـوو لـە جزیرێ.

٢. **نیـشانی:** چـونکە دلی خـۆی کردبـووە نیـشان بـۆ تیرێـن ئـەڤینا دلبەراخۆ، یان ژی دبیت مەرەما وی ئـەو (نیـشان) بیـت یـا لـسەر ڕوویێ یارا وی کو گەلـەك جـاران بەحـسێ خـەت و خـاڵ و نیـشانان دشیعرێن خۆدا کریە.

جزیری لە تەمەنی حەفتاو پێنجساڵیدا، لە ساڵی ١٠٥٠ کۆچی، بەرامبەر ١٦٤٠ز کۆچی دوایی کردووە. گۆڕەکەی لە ئاڤا هێیێ مەدرەسا (سۆر) دایە لە جزیرا بۆتان. دیوانی جزیری زۆر جاران لە چاپ دراوە:

١. چاپی یەکەم، یا کورد ناسێ ئەلمانی (فۆن مارتن هارتمان) بەرلین ١٩٠٤ز.

٢. چاپی قامشلۆ (لەلایەن مەلا ئەحمەدی ژنگی) ١٩٥٩ز.

٣. چاپی مامۆستا صادق بەهائەددین ئامێدی، ١٩٧٧ بەغدا.

٤. شەرحی هەژار موکریانی ١٩٨٠ تەهران.

٥. چاپی دووێ لاتینی ١٩٩٢، ئەستەنبول.

## شۆخو شەنگێ

| | |
|---|---|
| ١. شۆخو شەنگێ زهرە ڕەنگێ | دل ژ من بردل ژ من |
| ٢. ئاورین هەیبەت پلنگێ | دل ژ من بر دل ژ من |
| ٣. وێ شەپالی مسك خالی | دیم دوڕێ گەردەن شەمالێ |
| ٤. جەبهەتا بسکان سەماڵێ | دل ژ من بر دل ژ من |
| ٥. زولفو خالان نوونو دالان | وان ژ من دل بر ب تالان |
| ٦. گۆشەیێ قەوسێ هیلالان | دل ژ من بر دل ژ من |
| ٧. دیم نە دیرێ بوو عەبیرێ | خەمری و گیسوو حەریرێ |
| ٨. سینەکر ئامانجێ تیرێ | دل ژ من بر دل ژ من |
| ٩. سور شیرینێ نازەنینێ | کوشتمو ناکت یەقینێ |
| ١٠. وێ ب چەنگالا ئەفینێ | دل ژ من بر دل ژ من |

**١١. هەر دوو چەشمان نازو خەشمان کێ ژ بەر وان عەقل‌و هش مان**

**١٢. ساعەتا من دی ب چەشمان        دل ژ من بر دل ژ من**

**١٣. ڕوهنی یا چەهڤێن مەلایێ        ئەو تەجەللایا تەدایێ**

**١٤. یا ژ ئەحمەد دل ڕەڤایێ        دل ژ من بر دل ژ من**

(لەسەرەتاوە، پێنج دێڕی بۆ لەبەرکردنە)

## ڕاڤەکرنا پەیڤان

↑ ↓

لێ : بەلام

ژبلی : بێجگە

بسك : زولف

سینە : سنگ

ڕەڤایێ : ڕفاندی

وێ شەپالا : ئەو جوانەی

ڕێ ب چەنگالا ئەڤینێ : ئەو بە چەنگاڵی ئەڤینێ

بوو عەبیرێ : بۆنی وەك عەبیر

گیسوو : بسك

سینەکر : سینگی کردە

ڕوهنی یا : ڕووناکی

چەهڤێن : چاوەکانی

# حاجی قادری کۆیی

## ١٨١٧- ١٨٩٧ز

حاجی قادر کوڕی مەلا ئەحمەدە، لە گوندی (گۆڕ قەرەج)ی سەر بەشاری کۆیە لە ساڵی ١٨١٧ز لەدایك بووە، لە ئەستەنبول، لە ساڵی ١٨٩٧ز کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێ هاتیە ڤە شارتن.

حاجی، یەکێکە لە شاعیرە نەتەوە پەرستو نیشتمانپەروەرەکانمان، سەرەتای ژیانی شاعیرییەتی لە کوردستانی عێراقو ئێران دەست پێ کردووە، چونکە پاش گەشتەکەی ناوچەی باڵەکایەتی کە لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە لە ١٨٥٣- ١٨٥٤ز دەستییان پێکرد، ئەو، ڕوو دەکاتە کوردستانی ئێرانو ماوەیەکی زۆر لەوێدا دەمێنێتەوە، شیعرەکانی ئەو سەردەمەی حاجی بە دەوری تەوەرەی دڵداریو ئەڤینییەوە دەسوڕانەوە، ماوەیەکی زۆر پاش گەڕانەوەی لە گەشتی خوێندنەکەی، لە کۆیە دەمێنێتەوە، بەڵام وا دیارە مەلاییێکی ڕووناکبیری وەك حاجی نەشیایە لەناو کۆمەڵی ئەو کاتەی کۆیە ژیانەکا ئاسودە بەسەر ببات، هەر ژ بەر هندێ ناچار بویە، کو ڕوو بکەتە ئەستەنبوڵی پایتەختا دەوڵەتا عوسمانلیو هەمی ژیانا خۆ لوێرێ بسەر ببەت.

هە ژی گۆتنێیە، کو حاجی تا نەچووەتە ئەستەنبول زۆر بەلای شیعری نەتەوەییو کۆمەلایەتیدا نەچووە، دیارە وەرچەرخانی حاجی بەلای ئەو جۆرە شیعرانەدا دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی وەکو:

١. حاجی لە ئەستەنبۆڵێ کەوتە ناو ژیانێکی نوێو تازەوە، ئەو ژیانە نوێیە گۆڕانێکی سەرەکی بەسەر بیروباوەڕی حاجی داهێنا،

چونکه شاری ئەستەنبولی ئەو کاتە جێی کۆبوونەوەی هەموو ئازادیخوازانی وڵاتانی عوسمانی بوو، حاجی ئاگاداری تێکۆشانی ئەو نەتەوە ژێر دەستانەی عوسمانی بوو، بۆیە ئاوڕێکی لە میللەتەکەی خۆی دایەوەو کانیاوی شیعری نەتەوەیی لای ئەو تەقییەوە.

٢. لە شاری ئەستەنبوولدا، حاجی بە بنەماڵەی کورد پەروەری بەدرخانییان گەیشتو بوو بە مامۆستای کوڕەکانیان، دیارە ئەو بنەماڵەیە کورد پەروەر بوون‌و دەمێك بوو لە پێناو ئامانجە ڕەواکانی کورددا درێژەیان بە خەباتو تێکۆشان‌و بەرخۆدان دەداو کارێکی گەورەیان کردە سەر بیروباوەڕی حاجی قادر.

٣. حاجی قادر، هەر لە ئەستەنبوولدا، مەم‌و زینی ئەحمەدی خانی کەوتە دەستو پێشەکییەکەی خوێندەوە، ئەو پێشەکییەو دەیان کتێبی ڕەوشنبیری تازە بابەت کە لە ئەورووپاوە دەهاتن‌و دەکران بە تورکی‌و دەهاتنە بڵاوکردنەوە، وایان کرد کە بیرو هەستی نەتەوایەتی لای حاجی سەر هەڵبدا.

٤. دیارە ئاوارە بوون‌و دوور کەوتنەوە لە زێدی باوو باپیرانمان کارێکی گەورە دەکاتە سەر مرۆڤ و وای لێ دەکات کە هەمیشە بیرو باوەڕو هەستو هۆشی لای وڵاتو شارەکەی بێت، لەبەر ئەوە مرۆڤی ئاوارەو دوورە وڵات، بەتایبەتی ئەگەر وەك حاجی ڕووناکبیریش بێت، هەمیشە سۆزو هەستی لای نیشتمانەکەی دەبێت. هەر چەندە حاجی قادری کۆیی بە یەکەم شاعیری

نەتەوەیی دانانرێ چونکە بەر لە ئەو ئەحمەدی خانی ١٦٥٠-١٧٠٦ز وەك ڕابەری شیعری نەتەوەیی لە ئەدەبیاتی کوردیدا، دەردو ئازاری کوردی دەست نیشان کردووە، بەڵام حاجی سەرەڕای دەست نیشانکردنی ئەو دەردانە، زۆر جاریش هەوڵی داوە چارەیان بۆ بدۆزێتەوە، بۆ نموونە:

١. حاجی دەردێکی کوشندەی لای کورد دەست نیشان کردووە کە دووبەرەکیو نا تەبایيو دوژمنایەتی کردنی یەکترییە، دەرمانی ئەم دەردەش لای ئەو تەنیا هەر ڕێك کەوتنو یەك ڕیزییە.

**تا ڕێك نەکەون قەبیلی ئەکراد**

**هەروا دەبنە خەرابە ئاباد.**

٢. حاجی، دوژمنی سەرەکی دەست نیشان کردووە کە تەماحکارو داگیرکارانی کوردستانن، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دوژمنەش (چەك)ی بە چارەسەرداناوە، چونکە وا دیارە ئەو کاتەش زمانی سەردەم چەك بووە، بۆیە دەڵێت:

**صەلاحی ئێوە ئیستێکە سیلاحە**

**تەماعی گەورەیی بێ چەك نەکەن نەك**

٣. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، حاجی وەك هەر ڕووناکبیرێکی تازە، زانستو چەکی، پێکەوە کردوون بە دوو مەرجی سەرەکیو بنەڕەت بۆ خەباتو بەگژداچوونەوەی دوژمن، بۆیە دەڵێن:

**بەشیرو خامە دەوڵەت پایەدارە**

**ئەمن خامەم هەیە، شیر نادیارە**

٤. دیسان ڕووناکبیریو تێگەیشتوویيو هوشیاری حاجی لەوەدا بووە کە ڕێکخستنی یا بەزمانی ئەمڕۆ، پێکهێنانی حزبو ژیانی پارتایەتیو کاری نهێنیو تەگبیرکردنو پەیداکردنی چەكو تیفاقی شەڕ بە مەرجی سەرکەوتن دادەنێت.

٥. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە کە حاجی پێی وابووە کە پێویستە گەل بەدەوری سەرکردەیێك کۆ بێتەوەو ئەو سەرکردەیە وەك ڕابەرو پێشڕەوی خەباتی نەتەوەیی میللەت لە دەوری خۆیدا گردکاتەوەو بەرەو ئامانج بیان بات. ئەمەش لەم هۆنراوەیەدا دەردەکەوێت کە دەڵێت:

**١. لە ڕۆما[1]. کەوتە بەر چاوم کەسێکی هائیمو حەیران**
**بە هەیئەت تێی گەییم کوردە بە شێوەی ئەهلی کوردستان**

**٢. کە چوومە خزمەتی پرسیم: برادەر خەڵکی کام جێگای؟**
**لە کام لا هاتووی؟ گریا، گوتی: بابان! گوتم: بابان؟**

**٣. دڵم داوە گوتم: باوکە هەموومان بێ کەسین لێرە**
**چ قەوماوە، گەلێ حەیفە، مەگرییێ هەر وەکوو باران**

**٤. گوتی بۆ غوربەتو ڕووتی نیە ئەفغانو هاوارم**
**لە داخی حاکمی خۆمە، لە شانو شەوکەتی تورکان**

**٥. گەلێکم بیستووە پەستیو بڵندیی دەوڵەتان، ئەمما**
**جیهان نەیدیوە پەستی وا میسالی حاڵی کوردستان**

---

(١) مەبەست لە (ڕۆم): شاری ئەستەنبوولی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانلییە.

٦. لە وەقتی خۆی هەموو شا بوون، سەراپا بێ غەم‌و شابوون
لە جوودا حاتەمی تائی، لە شەڕدا ڕۆستەمی مەیدان
٧. لە پێشا خاکی مە لانەی پڵنگ‌و شێری ئازا بوو
ئەمێستا مارو مێروو، گورگ‌و ڕێوی لێی دەکەن سەیران!
٨. لە کوێ ما نەعرەتەی تەقلەو جلیت‌و ڕمب‌و ڕمبازی!
لە کوێ ما دەنگی زوڕناوو دەهۆڵ‌و شایی‌و سەیران!
٩. لە هاڕەی شەش پەڕو نەڕەی سوارو بەرقی شەشخانە
لە تەقەقەی ناڵ‌و شەقەقەی سم، لە ڕەقەقەی تۆبزو قەڵغان
١٠. دەهاتە جونبوش‌و لەرزین لە ماهی بگرە تا ماهی
لە سەحرا چەندە وەحشی بوون لە ترسان چوونە سەر کێوان
١١. لە ڕیزی زەبرو زەنگی وان کەسێکی تر نەبوو هەرگیز
بەشیرو حیشمەتی کوردە کە ماوە دەوڵەتانی ئێران
١٢. سەراو ئەیوانیان ئێستا کەلاوەی کوندە بوو و جوغدە
ئەگەر مەیدان‌و دیوانە سەراپا بوویتە جێی دۆمان
١٣. لە پاشی ئەو هەموو گریان‌و ناڵەو زارییە پێم گوت:
عەزیزم غەم مەخۆ هێندە، لە سایەی ڕەحمەتی ڕەحمان
١٤. ئەمیرێك ماوە پاشایە، گوتی: کێیە؟ گوتم: شێرە
گوتی: لێرە؟ گوتم: لێرە! هەتا تاران‌و هیندستان
١٥. بە خۆی شێرە وەکوو ناوی، لە شەڕدا دوژمن ئەندازە
تەمایان هەر بە ئەو ماوە جەمیعی خاکی کوردستان
١٦. هەچی جێگەی ئومێدمانەو ئەوی دڵ خۆش دەکا ئەمڕۆ
کەسی دی لەو بەدەر نابێتە غەمخۆری گەلی کوردان

(پێنج دێڕ بۆ لەبەرکردنەن)

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | | |
|---|---|---|
| گەشت | : | سەیران، گەڕیان |
| نەشیایە | : | نەیتوانیوە |
| هەژی گۆتنێیە | : | ئەوەی شایانی گوتنە |
| ئاوارە بوون | : | مشەخت بوون، دەربەدەر بوون |
| زێدی باوو باپیران | : | جهێ باوو باپیران یان وارێ باوو باپیران |
| تێی گەییم | : | من زانی، ئەز تێگەهشتم |
| بابان | : | مەبەستی ناوچەی ئەمارەتی بابانە لە سولەیمانیو دەوروبەری. |
| ئەفغان | : | فوغانو گریان |
| پەستی | : | پەستو غەمگینی |
| هەموو شابوون | : | هەمی شاە بوون (پادشاە بوون) |
| بێ غەمو شابوون | : | بێ غەمو شادبوون |
| لانەی | : | لاندکا، لانکەی |
| ئەمێستا | : | ئێستا، هەنووکە، نهۆ |
| جلیتو ڕمبو ڕمبازی | : | جلیدانو ڕمبازی |
| شەش پەڕ | : | جۆرە تفەنگە |
| شەش پەڕو شەشخانە | : | ناوی تفەنگن |
| جونبوش | : | جلف |
| قەلغان | : | مەتالێ |
| لەماهی بگرە تا ماهی | : | لە ماسی تا مانگ (هەیڤ) |
| جوغد | : | جۆرێکە لە کوندەبوو. |
| سەراپا | : | سەر تاپا، هەمووی ژ سەری تا پێیا |
| دوژمن ئەندازە | | دوژمن بە زێنە |

# وەلی دێوانە

## ١٨٢٦- ١٨٨١ز

ناوی (وەلیدە)ەو لە دەوروبەری ساڵی ١٨٢٦زدا لە ناوچەی (بەکراوا)ی نێزیك هەڵەبجە لەدایك بووە. لە تیرەی میکاییلی‌و لە خێڵی جافە، ئەو خێڵەی گەرمیان‌و کوێستانیان دەکرد، هەر لە منداڵییەوە شوان بووە، کە مەزنیش بووە، خۆشەویستی‌و ئەڤینی (شەمسە) یا (شەم)ی کەوتووەتە دڵەوە، ئەم خۆشەویستییە سەرچاوەو ئیلهام بەخشی شیعری وەلی بووە، زۆربەی شارەزایانی ئەدەب لەو باوەڕەدان کە نەخوێندەوار بوو بێت، بەڵام چەند نیشانەیەك بە لای ئەوەدا دەچن کە دەبێ خوێندەواری هەبووبێت‌و شارەزاو ئاگاداری شیعرەکانی حافزی شیرازی‌و فیردەوسی‌و سەعدی بوو بێت‌و ئەمانە یەکێك بووبن لە سەرچاوە زۆرەکانی ئیلهامی شیعری وەلی. لە هۆنراوەدا زیاتر بە لای مەبەستی دڵداریی‌و ئەڤینی‌دا چووە. زمانی شیعریی ڕەوان‌و سادەو ئاسان بووە، هەموو کەس تێی گەیشتووەو ئەم ئاسانییە تام‌و چێژێکی میللییان بە شیعرەکانی داوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە هۆنراوەکانی بە کێشی برگەیی خۆماڵی داناوەو بەشی زۆریشیان هۆنراوەی (دە) برگەیین، لە ساڵی ١٨٨١ز کۆچی دوایی کردووە.

## یـاران نـەجـەرگم

١. یاران نە جەرگم، یاران نە جەرگـــــم

من شەم شێومیێ تیردان نە جەرگـــم

٢. هەر وەخت کە مەیۆ ئاکامی مەرگـــم

ئەمانەت کەفەن نەکەن وە بەرگـــــم

٣. بەو شەرت نەشۆران حاشیەی ئەندامم

نە واکم پێش بۆ زوخاو نەزامـــــم

٤. شەهید ومبێ غەسل بێ کفن خاســەن

هەر کەس شەهیدەن هوون بێ قەساسەن

٥. بەڵام وەسیەتم جەلاتان ئیـــــــدەن

ئەر سەد دوور نە خاك گۆرخانەو زێدەن

٦. با هەر مەزارم نە ڕای خێڵان بــــۆ

نە گوزەرگای شەم جەبەل گێلان بــۆ

٧. میلێ وە ئەندام بە ژنو باڵای شــــەم

بکەن بە فەرقم بەبێ زیادو کـــــەم

٨. تاقێ هەر نە تەرح تاقی ئەبرۆی ئــەو

بسازان نە فەوق مەزارم جەنـــــەو

(پێنج دێر بۆ لەبەرکردنو واتا زانینە)

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

١. نە جەرگم : لە جەرگم

نە : لە

تیردان : تیری داوە، تیری لێداوە

(یاران‌و دۆستان، کەسێك کە لەشێوەی (شەم)دایە، تیری لەجەرگی من داوە)

٢. مەیۆ : دیٚ، دیٚتن، دهێت

ئاکامی مەرگم : وەختی مەرگ‌و مردنم، وەختیٚ مرنا من

ئامانەت : دەخیل، تکا، ئامان

(هەر کات‌و گاڤەکی کە کات‌و وادەی مردنم دێت، تکاتان لیٚ دەکەم کفنم بۆ مەکەن بە بەرگ)

٣. نەشۆران : نەشۆن

نەواکم : نەوەکو، نەبادا

پێش بۆ : پێوە بووبیٚ، پێڤە بیتن

زوخاو : خوێناو- خویناڤ

نەزاحم : لە برینم

زام : برین

(بەو مەرجەی کە حاشیەی ئەندامەکانم نەشۆن، نە بادا زام‌و برینێن من خوین پێڤە بیت‌و ژ ئەگەرا شوشتنا وان ئەڤ خوینە پێڤە نەمینت).

٤. خاسەن : باشە، چاکە

هوون : خوێن، خوون، خوین

قەساس : عەزاب، قصاص، تۆڵە

(شەهید ژی بیٚ شویشتن‌و بیٚ کفن کردن باشە، چونکی خوینا

شەهیدی هیچ حساب ل سەر نینە)

٥. جەلاتان : لەلاتان، ژنك هەوە.

جە : لە

ئیدەن : ئەوەیە، ئەڤەیە

گۆڕخانەو زێدەن : شوێنو جهێ ژ دایك بوونێ.

گۆڕخانە : گۆڕستان

(بەڵام وەسیەتا من ل نك وە ئەوە، هەر چەند ئەز ل شوێنو جهێ ژ دایك بوونا خۆ دوورم).

٦. مەزار : گۆڕ

نەڕای : لەڕێی

نەگوزەرگای : لەسەر ڕێی هاتوو چۆی

جەبەل گێلان : گەڕیدەی ناوچە شاخاوییەکان

(با، گۆڕەکەم هەر لەسەر ڕێی هاتوچۆکردنی خێلان بێ، لەسەر ڕێگای شەمو ئەو کەسانە بیتن کە بەناوچە شاخاوییەکاندا دەگەڕێن).

٧. فەرق : کێل، قێلی قەبر

(میلێ ئەوەندەی بە ژنو باڵای شەم بە بێ کەمو زیاد بۆ من بکەن بە کێلی قەبر).

٨. نە تەرح : لە تەرحی، لە نەوعی، وەکو

بسازان : بسازن، دروست بکەن، چێ بکەن.

جەنەو : لە نوێ، سەر لەنوێ، ژ نووڤە.

(تاقێکی وەکو تاقی برۆی ئەویش، سەر لەنوو لەسەر گۆڕەکەم دروست بکەن).

## پیرەمێرد

## ١٨٦٧- ١٩٥٠ز

حاجی تۆفیقی کوڕی مەحموود ئاغای مەسرەفە، لە ساڵی ١٨٦٧ز لە شاری سولەیمانی لەدایك بووەو لە ١٩٥٠ز هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە، لە گردی (مامەیارە) نێژراوە، لە زۆربەی مزگەوتەکانی سولەیمانی خوێندوویەتی، لە ساڵی ١٨٩٨ز لەگەڵ شێخ سەعیدی حەفید (کە دەکاتە باوکی شێخ مەحموودی نەمر) چوو بۆ تورکیاو لەوێوە بۆ ساڵی دوایی چوونەتە حەج. لە نووسینی فارسیدا دەستێکی باڵای هەبوو، لە ساڵی ١٨٩٩ز دەکرێتە ئەندامی مەجلیسی عالی لە ئەستەنبوول، هەر لەو کاتەدا دەچێتە (مەکتەبی حقوق) و بڕوانامەی حقوق وەردەگرێت، هەر زوو دەستی بە ڕۆژنامەنووسی کردووەو ڕۆژنامەی (کورد)ی لە ئەستەنبوول بەڕێوەبردووە، بووە بە قایمقامی (جۆلە مێرگ)و لە ١٩١٨ز بە پارێزگاری (ئەماسیە) لە تورکیا، دەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی، تا لە ساڵی ١٩٢٦ز دەبێتە سەر پەرشتکاری ڕۆژنامەی (ژیان) کە لەلایەن شارەوانی سولەیمانی دەردەچوو، لە ساڵی ١٩٣٧ز چاپخانەیەكو ڕۆژنامەیەکی دامەزراند بەناوی (ژین)ەوە، لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٠ز کۆچی دوایی کرد.

پیرەمێردی شاعیر، خاوەنی بیرو باوەڕێکی پێشکەوتووی ڕووناك بوو، باوەڕی تەواوی بە زانستو خوێندەواری هەبووە، زۆریش لای گرنگ بووە کە کچانی کورد بچنە قوتابخانەو بخوێنن، بە تێکڕایی پشتگیری لە مافی ژنان دەکردو ئەوانی بە نیوەی کۆمەڵ دادەنا، سەرەڕای ئەمەش

بیرو باوەڕێکی نەتەوەیی بەهێزی هەبوو، هەر ئەوەندەش بەسە بۆی کە جەژنی نەورۆزی زیندوو کردەوەو بەرگێکی نوێی کردە بەر، هەر لەم ڕوانگەیەوە هەوڵی دا نووسینی کوردی بکا بە لاتینی، بەڵام سەرنەکەوت پیرەمێرد وەکو چۆن لە شیعردا دەستێکی باڵای هەبوو، هەروا لە (پەخشان)یشدا دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، پەخشانەکانی سادەو بێ گرێ بوون، لە سەرەتادا هەموو ڕەگەزەکانی ڕەوانبێژی لە نووسینەکانیدا بەکارهێناوە وەك درکەو ڕەگەز دۆزیو خوازەو خواستن، پەیڤو وشەکانی خۆماڵیو سادە بوون، نووسینەکانی یەك زنجیرەیی بوون، بابەتەکانی نووسینی لە پەخشانیشدا مۆرکی ڕۆمانتیکیان پێوە بوو، لە نووسینەکانیدا کوردییەکی پەتیو ڕەوانی بەکارهێناوە ژمارەیەکی زۆری چیرۆکی دانراوو وەرگێڕاوی لە تورکییەوە بڵاو کردۆتەوە وەك (دوانزە سوارەی مەریوان)و (مەمو زین)و (کەمانچە ژەن).

## شیعرەکانی پیرەمێرد بەزۆری دەکرێن بە دوو بەش:

ئ- ئەو کۆمەڵە شیعرەی کە دەکەونە بەر ڕێبازی کلاسیكو، ئەوانە بریتین لەو شیعرانەی کە بەزۆری لە سەرەتای ژیانی شاعیرییەتیدا لە ئەستەنبوولو لە تورکیا دایناونو لە ژێر کاریگەرییەتی شاعیرانی وەك حافزی شیرازی فارسو نالیو سالمو حاجیو مەولەوی کورددا هۆنینیەوە.

ب- ئەو کۆمەڵە شیعرەی کە دەکەونە بەر ڕێبازی ڕۆمانتیك، ئەمەش هەنگاوێك بوو لەبەرەو پێش چوونی هونەری ئەدەبی لای پیرەمێرد،

دیاره ئەم ڕێبازەی لە ئەنجامی کارتێکردنی شیعرەکانی (عەبدولحەق حامیدو نامق کەمال)ی تورك گرتووەتە بەر، هەروەها پیرەمێرد شەیدای شیعرەکانی مەولەوی هەورامی بووە، بۆییٚ هەموو دیوانەکەی مەولەوی خستووەتە سەر شێوەی سولەیمانی، هەر لەژێر کاریگەرییەتی شیعرەکانی مەولەوی‌و بێسارانی‌و وەلی دێوانەدا، دەبینین زۆربەی هۆنراوەکانی پیرەمێرد (١٠) برگەیین کە ئەمە شێوەی شیعری (گۆرانی)یە لەناو کوردەواریدا، بەم جۆرە لە شیعری یەك قافیە دوور کەوتووەتەوە، وەك ئەم دێڕە:

گیا/ نە/ وە/ نەو/ شەو/ چـ/ نوور/ لە/ گەڵ/ گوڵ/ (١٠برگە)

سەو/ دای/ دیـ/ دە/ نی/ تۆ/ یان/ کەو/ تە/ سەر/ (١٠برگە)

هۆنراوەکانی پیرەمێرد بەتایبەتی‌و، نووسینەکانی بە گشتی چەند سیماو ئەدگارێکیان پێوە دیارە کە ئەمانەن:

١. لە هۆنراوەو نووسینەکانی (پەخشانەکانی)دا، کوردییەکی پەتی‌و ڕەوانی بەکارهێناوە، شارەزایی لە هەموو شێوەکانی زمانی کوردی هەبووە، لەبەر ئەوە دەبینین، ئەو زمانەی کە بەکاری هێناوە، ڕەوان‌و سقك‌و ئاسان‌و سادەبووە.

٢. لە هۆنراوەو پەخشانەکانیدا، هەوڵی داوە لە کۆمەڵانی خەڵك نزیك بێتەوەو بەرهەمێن خۆ ب زمانیٚ وان بنڤیسیت، داکو هەمی لیٚ تێبگەن‌و چەشەو خۆشییٚ ژ شیعرو پەخشانیٚ وی وەربگرن، هەر ژ بەرهندیٚ ژی پشکەکا زۆرا شیعرێن وی هەمیشە ل سەر زارێن خوێندەڤانان بوویە.

٣. له هەموو مەبەستەكانی هۆنراودا بەرهەمی هەیە، وەكو كۆمەڵایەتی، ئەڤینی، نیشتمانیو... تد، بێجگە لەوەش، بەشێكی زۆری پەندی پێشینانی كوردی كردووە بە هۆنراوەو بڵاوی كردوەتەوە.

٤. زۆربەی شیعرەكانی مۆركی خۆماڵییان پێوەیە، چونكە لەم لایەنەوە كەوتووەتە بەر كاریگەرییەتی شیعرەكانی مەولەوی، بێسارانی، وەلی دێوانەوە، بۆیێ بەشی زۆری هۆنراوەكانی لەسەر كێشی (گۆرانی)ن، بەتایبەتی (وەكو گوتمان) كێشی (١٠) بڕگەیی.

٥. بەشی هەرە زۆری هۆنراوەكانی، دەكەونە خانەی ڕۆمانتیكییەوە، ئەمەش لەبەر كاریگەرییەتی ئەدەبیاتی توركی بووە، كە پیرەمێرد شارەزاییەكی تەواوی تیادا هەبووە.

## نموونەیەك لە هۆنراوەكانی:

### (ئەبێ بەخشندە مل كەچ كا)

١. ئەبی بەخشندە مل كەچ كا، لە ڕاستی مووچە خۆری خۆی
سوراحی سەرفرودێنێ لە بۆ پیاڵە كە تێكا بۆی

٢.كە ئاو داری لەسەر سەرگرتووە، ئەیزانی چی تیایە
لە لای نەنگە كە پەروەردەی نقوم كا، گەورەیی وایە

٣.لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەركی بەردوو دار
پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە، لە قەش بۆ سەرپەلی بەردار

٤.لە دەوری دووریا پەستم دەروون پڕ دەردو زووخاوم
ئەجەل دێ بمكوژێ، نامناسێ چی بكەم نامرم ماوم!!

٥. لەبەر ئاشووبی خێڵم، هیچ شەوێ خەو نایەتە چاوم

خەوی ناخۆش ئەبینم، بەم پەریشان خاوییە خاوم

٦.ئومێدی سەر لەسەر دەرکەن ئەوانەی ڕاستو ڕووناکن

قەڵەم هەر سەرقەڵەم، مۆم بۆ مقسەت، هەر بۆ ئەویش چاکن

٧. ئەڵێن مورغی سولەیمان ئاو لەژێر خاکا ئەبینێ ئەو

منیش حەوت ساڵە ڕێ دوور بێ، بە چاوی دڵ ئەبینم ئەو

٨.چرا ڕووناکی بۆ ژێر خۆی نیە، ڕەحمەت لە بابیبا

ئەوی ڕووناکی کەچ بینانە گۆڕە ڕەنجی بابیبا

٩.بە جووت پەروانەوو ماسی کە دڵدادەی چراو گۆلن

نزیکی ئەم ئەسووتێنێ، لەدووری ئاو ئەوان حۆلن.

(پێنج دێر لەبەرکردنو واتا زانینە).

## ڕاڤەکردنی پەیڤان

| | |
|---|---|
| بەخشندە | : ئەو کەسەی کەشت دەبەخشیّ |
| مل کەچ کا | : سەر شۆرکا |
| لە ڕاستی | : لەبەرامبەری، ل هەمبەرا وی |
| سەر فرودێنیّ | : سەری شۆڕکا، خۆ سەرەو ژێر دەکا |
| لەلای نەنگە | : لەلای شوورەییە، لەلای عەیبە، شەرمە ل نك وی |
| پەروەردەی | : ئەوەی خۆی بە خێوی کردووە، ئەوی ب خۆ بخودان کری. |
| نقوم کا | : بیخاتە ژێر ئاوەوە |
| پەلی بەرد | : گاشە بەرد |
| پەلی بەرز | : لق و پۆپی بلّندی درەخت. |
| لە قە | : پێن، پێلاقە |
| زووخاو | : خوێناو |
| ئاشووب | : شەڕو فتنەو هەراو هۆریا |
| خێلّ | : قەوم، عەشیرەت |
| ڕەحمەت لە بابیبا | : ڕەحمەت لەو بابەی کە دەیکۆژێنێتەوەو دەیبا |
| گۆڕە | : حەق وایە |
| دلّدادە | : عاشق |
| گۆل | : گوماو |
| حۆلن | : گێژن |
| نێژراوە | : هاتیە ڤەشارتن: بن ئاخ کرن. |

## ٣. گـــــــــۆران

## ١٩٠٤- ١٩٦٢

ناوی (عەبدوڵڵا کوڕی سلێمان بەگ کوڕی عەبدوڵڵا بەگ)ە، لـە سـاڵی (١٩٠٤) لە شاری هەڵەبجەی شەهید هاتۆتە دنیاوە، سـەرەتای خوێنـدنی لای بـاوکیو دوایـی لـە مزگـەوتی (پاشـا) دەسـت پێکـردووە، ئـەمجا لـە قوتابخانـەکانی هەڵەبجـەدا خوێندوویـەتیو دوایـی چـۆتە قوتابخانـەی زانستی لە کەرکووك، لەبەر تەنگو چەڵەمەی ڕۆژگـارو دەسـتکورتی وازی لە خوێندن هێناوە، لە ساڵی (١٩٢٥)دا بووە بـە مامۆسـتای قوتابخانـەی هەڵەبجـەی سـەرەتایی، لەگـەڵ قوتابخانـەی تـری ناوچـەکەدا مامۆسـتا بـووە، پاشـان گوێزراوەتـەوە بـۆ کـاری تـری مـیری، لـە سـەردەمی پاشایەتیدا تووشی گرتنو بەندیخانەو ئەشکەنجەدانی دڕندانە هاتووە، لە ئەنجامی تێکۆشانی خۆیدا پێـنج سـاڵ زینـدانی کـراوە کـە لـەو ڕۆژانـەدا منداڵەکانی لە باوەشی نەبوونیو بێکەسیدا بە جێهێشت، بەڵام خۆی هەر وەك نموونەی بەرزی تێکۆشەرێکی کورد پیشان دەداو خۆیو هـۆنراوەی خۆی بەخشی بە مەسەلەی ئاشتیو نەتەوەی کورد.

مامۆستا گۆران لـە ڕۆژنامەگەریـدا کـاری کـردووە، لـە سـاڵی (١٩٥٣) دەبێت بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ژین)و لە ساڵی (١٩٥٩) سەرپەرشتی گۆڤاری (شەفەق) دەکات، کە بەناوی (بەیان)ەوە دەریکردووە.

لە ناوەڕاسـتی سـاڵی (١٩٦٠)دا دێتـە بەغـداو دەبێـت بـە وانەبێـژ لـە بەشی کوردیی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا، هەر لەو کاتەشـدا بـووە بـە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی (ئازادی).

مامۆستا گۆران شارەزایی خۆی لە بەرهەمی فۆلکلۆری نەتەوەکەیو کارتێکردنی هۆنراوەی شێوەزاری هەورامی، ئەمجا ئەدەبیاتی تازەی (تورکیو ئینگلیزی)، وایان لێکرد لە مەیدانی هۆنراوەدا گۆڕانکارییەکی بەرچاو بەرامبەر بەرێبازی کلاسیکی بەرپا بکات، واتای تازەی لە هۆنراوەدا داهێناوەو ڕچەی کێشو سەروا کۆنەکانی گۆڕیو پەیڕەوی کێشی پەنجەی خۆماڵی کرد، کە لە سەرەتاوە هەر پەیڕەوی شاعیرانی پێش خۆی کردووە، ئا لێرەدا گۆران یەکێکە لە ڕابەرانی نوێکردنەوەی هۆنراوەی کوردی لەگەڵ شێخ نوری شێخ ساڵحو ڕەشید نەجیبو پیرەمێردو قەدری جان...

بەرهەمە چاپکراوەکانی بریتین لە: (بەهەشتو یادگار)، (فرمێسكو هونەر)، (سروشتو دەروون)، (لاوكو پەیام)، سەرجەم بەرهەمی گۆران لە (دیوانی گۆران)دا ساڵی (١٩٨٠) چاپ کراوە.

هەروەها کۆمەڵە چیرۆکێکی ئەوروپایی لە زمانی ئینگلیزییەوە گۆڕیوە بۆ زمانی کوردیو بەناوی (هەڵبژاردە)وە بڵاو کراوەتەوە.

گۆران جگە لە هۆنراوە، پەخشانی هونەریشی نووسیوە.

لە ساڵی (١٩٦٢)دا لە ئەنجامی نەخۆشییەکی کوشندە بە یەکجاری چاوی لێکدەنێتو لە گردی سەیوان بە خاك دەسپێردرێت.

## نموونەیێك لە هۆنراوەكانی:

### بەڕێگەدا بەرەو كۆنفرانس[1].

بە هەنگاوی گورج و درێژ

ئەبڕین ڕێگەی هەورازو لێژ

بە دەم سەر گەرمی هیواوە

بە باڵ ئەفڕین

لە شەقڵاوەی خانزادنشین

(دڵە زۆر تەڕەكەی سەفین!)

دووەم كۆنفرانس ئەبەستین

مامۆستایان ئەیانەوێ

هەتاوی كورد زوو دەركەوێ

ڕێی بیر بۆ مێشكمان خۆشكەن

زمانمان بە كوردی گۆشكەن

ئێمەش شوێنكەوتووی كاروانین

هەم خانەخوێین، هەم میوانین

بە هەنگاوی گورج و درێژ

ئەبڕین ڕێگەی هەورازو لێژ

---

(١) مەبەست كۆنفرانسی دووەمی مامۆستایانی كوردە كە لە هاوینی (١٩٦٠)دا لە شەقڵاوە گیرا، لە گیرو گرفتەكانی خوێندن و نووسینی كوردی كۆڵییەوەو نوێنەری مامۆستایانی هەموو شارەكانی كوردستانی عێراق و هەموو بیروباوەڕە نیشتمانییەكانی ناو مامۆستایانی كورد تێدا بەشداربووە، كۆنگرەی یەكەمیش لە هاوینی (١٩٥٩)دا هەر لە شەقڵاوە گیرا.

بــــه دەم ســـــەرگەرمی هیـــــواوە
بـــــــه بـــــــاڵ ئـــــــەفڕین
کۆنفرانـــــــسی دووەم ئـــــــەگرین
ئەگــــــەر دوێنـــــێ مامۆســـــتاکان
یـــــەك ســــــوڵتانیان پێئەگـــــەیان
ئـــــەمڕۆ ئـــــەبێ مامۆســـــتای کـــــورد
دانیـــــــشێو بـــــــه ڕاوێـــــــژی ورد
ڕێگـــــــەی پێگەیانـــــــدن دانـــــــێ
بـــــۆ ملیۆنـــــان نـــــەك ســـــوڵتانێ
کـــــام گەوهـــــەر گـــــران بـــــەها بـــــێ
بـــــه زانـــــستی کـــــورد ڕەوا بـــــێ
لێـــــی پـــــڕ ئەکـــــەن کیـــــسەی دیـــــاری
ئەیبـــــەن بـــــۆ دەزگـــــای زانیـــــاری

(له سەرەتاوە پێنج دێر بۆ لەبەرکردن)

